

عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا

# ئەی ڕەقیب

## لەنێوان جەستەی زمان و جەستەی نەتەوەدا

وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٥٧٣)



# ئەی رەقیب

## لە نێوان جەستەی زمان و جەستەی نەتەوەدا

(چوار خوێندنەوەی جیاواز لە سەر بنەمای گفتوگۆو دانوستان)

عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا

٢٠٠٨ - سلێمانی

# نەی رەقیب

## لە نێوان جەستەی زمانو جەستەی نەتەوەدا

بابەت: لێکۆڵینەوە

نووسەر: عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا

تایپ: نووسەر

نەخشەسازی: مەهدی ئەحمەد

نەخشەسازی بەرگ: جەبار سابیر

چاپی: یەکەم - ٢٠٠٨

چاپخانە: چاپخانەی شڤان

تیراژ: ٥٠٠ دانە

ژمارە سپاردنی ٥٧٧ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێدراوە

ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی- گردی ئەندازیاران: ١٠٥ کۆڵانی، ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٢١٨٠٩٩٤

بێ کەس منم، کەسێ لە زوبانم بگا نییە
هەمدەم خودا نەناس و دەم پڕ لە یاخودا

( مەحوی )

فیکری راستەقینە دەسەلاتی خۆش ناوێت، نابێتە بابەتی ململانێ، بەڵکو دەبێتە بابەتی گفتوگۆ و دانوستاندن.

ئەدۆنیس-الكلام و النظام

# ناوەرۆك

پێشکەشە :

بە ( دڵدار )و خەیاڵی داهێنەرانەی خوێنەرە جیاوازەکانی ( ئەی ڕەقیب ).

ئەبێ گوزەر کەین

ببینە هاوەڵی ئاسۆ دوورەکان

لە دەماری پیتێکدا دەوار هەڵدەین

ئەبێ گوزەر کەین

ناو بە ناویش

تووی سەر لقێك بخۆین

سهراب

## پێشەکی:-

**شادکردنی کەسێ مانای غەمبارکردنی کەسانی دی نییە.**
**( پاولۆ کۆیلۆ )**

لە پشت ناونیشانی سەرەکی ئەو کتێبەوە دەشێ دوو بیرۆکەی سەرەکی خۆیان مەلاس دابێت، یەکێکیان خۆی لە دەستەواژەی جەستەی نەتەوە هەڵدەگرێتەوە، ئەویدیکە بە جەستەی زمانەوە دەلکێت، دەشێ لە پشت جەستەی نەتەوە ئاگایی و هوشیاری وەکو پێداویستیەکی گرنگ خۆیان بنوێنن، یان ئەو هوشیارییە لەوێوە بەرجەستە بێت کە نەتەوەبوونی لێدەکەوێتەوە، ئەو بە نەتەوەبوونە لای کورد دوایی شکستی ئیمپرتۆریای عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانی زۆر بە جوانی لە سرودی (ئەی رەقیب) دەردەکەوێت، بەڵام جەستەی زمان لە کوێ ئەو پەیوەندییانەوە هەڵدەقوڵێت، کە سیستەمی زمانی لێپێکهاتووە، هەر لەوێشەوە پەیوەندی بە ئاگایی و هوشیاری دەقەوە دەکات.

کەواتە گرنگی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەوێوە دێت، کە لە رێگەی خوێندنەوەی زمان کە بنەمایەکی سەرەکی پێکهێنەری نەتەوەیە، هەوڵی بەرجەستەکردنی جەستەی نەتەوە دەدا، واتە لە بەشەوە دەیەوێت گشت بەرجەستە بکات. هەروەها بە دیوێکی دیکە ئەو لێکۆڵینەوەیە لە رێگەی پشت بەستن بە خوێنەرەوە باز بە سەر

وشەو چەمكو پەیوەندییە تێكچڕژاوەكانی هەردوو جەستە دەدا، بـۆ ئـەوەی (دڵـدار) وەك بیرخەرەوەیـەك دەسـت بخاتـە نێـو گێڕانەكانـەوە، یـان نەتـەوەیبوون ئاراسـتەكان دیـاری بكـات، كۆمەڵێك خوێندنەوەی جیاواز بە هۆی لەیەكترازانی زنجیرە یەك لە دوا یەكەكانی وشەوە دەخەمە روو، بە مانایەكی دیكە لە لایەك هەوڵـدەدەم نەتـەوەیبوون نەبێتـە گرفـت بـۆ ئـازادیو فـەزای خوێندنـەوەكانو خوێندنـەوەكان نەشـێوێنێت، لـە لایـەكی دیكـە هەوڵـدەدەم بـە خـاوەنبوون لـە نووسـەر بسـێنمەوەو بیكەمـە هاوشـانی خوێنـەر، بەڵام نـەك بە مانـا (بـارت)ییەكەی كـە مـەرگی نووسـەر بـایی لـەدایكبوونی خوێنـەر بێـت، یـان بەرامبـەر لەدایكبوونی خوێنەر بكەوێتەوە، بەڵكو لەوێوە كە ئەرزش دانانـە بۆ پێدراوەكانی دیكە.

كەواتە دەمەوێت لە میانی رەشكردنەوەی منی نووسەرو منی نەتـەوە رەتكردنـەوەی منـی گێـڕەرەوەی دەقو لـەناوبردنی بەشتبوونی دەقەوە جیاوازییەكان بە شێوەیەكی رەها پرۆسیسە بكەم، ئیتر لەوێوە خود لـە بەرئەنجامی وزەو هێـزی دەسـتكردەوە بترازێت شتێكی دیكە نییە، وەك چۆن دەق نەزۆك نییـە، تـاكو بیر لە یادەوەریو بیرخەرەوە بكاتەوە، ئیتر نابێ یادەوەریو نەتـەوە بوون هیچ دەسەڵاتێكی بە سەر دەقەوە هەبێت، چونكە ئەوەی لـە رێگەی بە نەتەوە بوونو بە بیر هێنانـەوە بـە دەست دێـت هـەرگیز نابێتە ئیبـداعێكی شەخسـی ئـازاد، هـەروەها دەق چـەند وشـەیەك نییە كەوتبێتە سـەر كاغـەز، بەڵكو مانـاگـەلێكی بێ كـاتو شـوێنە

دەکەوێتــــە دەرەوەی بــــە خـــاوەنبوون‌و مانـــاو بنـــەما لەکارکەوتووەکان‌و یاساو ڕێساو سیستەمە دیاریکراوەکانەوە.

بـەمجۆرە هەوڵمـداوە لـە ڕێگـەی بەدواداچـوونی مەڵبەنـدێتی سـروودی (ئـەی ڕەقیـب)و تـەوەرەی ڕاڤەکارانییـەوە، کـە دەسـتی زۆری تێڕوانینی (کۆ)و دەسەلاٌتی سیاسیانەی نەتـەوەی تێدایـە، ئـەو قودسـیەتە تێکبشـکێنم، کـە بـەو سـرووده دراوە، لەوێشـەوە کۆمەڵێك هێلکاری بۆ خوێندنەوە جیاوازەکان دەکێشم‌و ئاماژە بە خەیاڵی داهێنەرانەی خوێنەران دەدەم.

ئیتر لـە میـانی ئـەو لێکۆڵینـەوەی بەردەسـتتان‌و لـە دەروازەدا قسـەم لـە مەسـەلەی هەڵبـژاردن‌و ئاسـتەکانی خوێندنـەوەو زمـانی دەق کـردووە، وەك چـۆن قودسـیەتی سـروودی (ئـەی ڕەقیـب)م بـە یادەوەری‌و ژانوژواری ناسیونالیانەوە بەنـد کـردووە، بـەر لـەوەی بلکێنم بە ئاستی زمان‌و هونەری چیگوتنەوە.

لە بەشی یەکەمدا کە دوو باس لەخۆ دەگرێت لە باسـی یەکـەم کـە دەکەوێتـە ژێـر ناونیشـانی سـتراتیژیەتی دەق هەوڵمـداوە بـە پێـــی بۆچـــوونی (کریســـتیڤا) پێناســـەی دەق ڕاڤـــە بکـــەم‌و پێکهاتـەکانی بخەمـە ڕوو، وەك چـۆن قسـەم لـە سـەر لێکۆڵینـەوەو ڕاڤـەکردن‌و جیاوازییـەکانی ڕەخنـەی ڕەخنـە کـردووە، دواجـار چـەمکی خوێندنـەوەم وەك چـەمکێك لـە لـە نێـو خۆیـدا هـەڵگری جیـاوازی جـۆراو جـۆرە خستۆتە ڕوو، ئـەو خوێندنـەوە جـۆراو جۆرانـەش لـە وزەو هێـزە دەلالـەتئامێزە نـەگوتراوو شـاراوەکانی چیگوتن‌و چۆنگوتن دایـە، هـەر لەوێشـەوە خـۆی لـە نێـو زمـان‌و ئاسـتە جیاوازەکـانی ڕۆشـنبیریی خوێنەرانـدا هەڵدەگرێتـەوەو بـە

دینامیکیەتی خۆی فەزایەکی ڕەنگاوڕەنگ دەکێشێت، هەر لەو فەزا ڕەنگاوڕەنگەوە زەمەنەکان دەبڕێت و چاوەڕوانی تایبەت بە خۆی دەخاتەوە. کەواتە لە بەر ئەوەی خەسڵەتی چەمکی دەقی ئەدەبی بە زمانەوە بەندە ئیتر لەوێوە دەشێ (یاریکردن) لە نێویدا کراوە بێت، دواجار پرۆسیسەکردنی دەق بەو مانایەی کە یارییەکی کراوەیە چێژو جوانی لێدەکەوێتەوە.

لە باسی دووەم واتە لە جیاوازییەکانی خوێندنەوەدا پرسیاری ئەدەب چییەم لە نێو دوو پێناسەدا خستۆتە ڕوو، یەکێکیان ئەو پێناسەیە کە بە کەشفکردنی دنیای مرۆڤەکانەوە بەندەو سەر بە (سارتەر)ە، ئەویدیکە (میلان کۆندێرا) بە لایەنە پەنهانەکانی بوونی مرۆڤی دادەنێت. لە نێوان ئەو دوو پێناسەیە باس لە تێڕوانین و جیهانبینی کراوەو هەروەها هەر یەك لە چەمکی بابەتخوازیو گوتاری ئەدەبی خراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، لە سەر بنەمای ئەو دوو بۆچوونە ماناکانی ڕەخنەو ڕەخنەی ئەدەبی سەرەڕای مەعریفەو شەپۆلە جیاوازەکانییەوە بە دوو شێوە خراوەتە ڕوو، یەکێکیان پەیوەندی بە میتۆدی دیاریکراو دەکات، ئەویدیکە لە کۆی مەعریفەی میتۆدەکانەوە گفتوگۆو دانوستاندن لەگەڵ دەق دەسازێنێت، کە دواجار دەقێکی دیکەی لێدێتە بەرهەم، ئەو دەقە نوێیەش بە پێی خوێندنەوەو خوێنەرە جیاوازەکان خۆی نمایان دەکات، لەوێوە گوتمە ئیبداع و پەڕگیری هەرگیز بە یەکەوە هەڵناکەن، چونکە پەڕگیری دەمارگیری بەرهەم دێنێت، بەڵام داهێنان ئەرزش بۆ هەمووان دەخاتە ڕوو، هەر لەوێشەوە دەڵێم پەیوەندی نێوان

دەق و خوێنەر پەیوەندییەکی کراوەوەیەو لە سەر دۆزینەوە وەستاوە، نەك پەڕگیری و حوکمکردن، بە جوانییەوە بەندە، نەك بابەت.... کەواتە لەو لێکۆڵینەوەی بەردەستتان هەوڵ دەدەم بڵێم ئەدەب بەردەوام لۆژیکەکان تێکدەشکێنێت و لۆژیکی تایبەت بە خۆی دادەمەزرێنێت، لۆژیکی ئەدەبیش راستەوخۆ بە خەون و خەیاڵەوە بەندە.

لە بەشی دووەم و لە باسی یەکەم قسە لە دوو جۆر لە زمان کراوە، جۆری یەکەم زمانی رەمزئامێزە و جۆری دووەم زمانی هەڵچوونئامێزە، ئەوەشمان لە رەخنەگری ئینگلیزی (رتشاردن) وەرگرتووە، مەبەست لە زمانی رەمزئامێز ئەو زمانەیە کە بۆ گەیشتن بەکار دێت، واتە زمانێکی ئامارەییەو تاکە وەزیفەی ئامانجی گەیاندنی خودی گەیاندنە. بەدیووەکەی دیکە زمانێکە نزیکە لە لۆژیکی عەقڵ و قابیلی قبوڵکردنە ئەگەر دروست بکەوێتەوە، وەك چۆن قابیلی نکۆڵیکردنیشە کاتێك نادروست خۆی نیشان دەدات، بەڵام زمانی هەڵچوونئامێز ئەو زمانەیە، کە ئامانجی لە گەیاندنی زانیارییەکان کورت ناکرێتەوە، بەڵکو زمانێکی بارگاوی و جولەئامێزەو دەمانخاتە نێو فەزای گومان و خەیاڵکردنەوە، هەرگیز خوێنەر لە رێگەی راستی و ناراستییەوە پێی ناگات، بەڵکو زمانێکە بڵاو دەبێتەوە خەیاڵ و بیرکردنەوە کێش دەکات، هەستەکان دەدوێنێت.

دەمەوێت (ئەی رەقیب) لە رووی داڕشتنی زمانەوە لە سەر هەر دوو زمانی (رەمزئامێز) و (هەڵچوونئامێز) بخەمە کار. واتە (ئەی رەقیب) وەك زەمەن لە رێگەی شتەکانەوە بەرەو وشەکانمان

دەکاتەوە، لە ڕێگەی زمانی ڕەمزییەوە (کوردی) لە نێو مێژوو ڕەنگ دەکات و بە شێوەیەکی لۆژیکی وێنەکان دەکێشێت و مانەوەی کوردی بە ڕەمزو لۆژیکی هۆکارئامێزەوە پەیوەست دەکات. بە دیووەکەی دیکەش بەردەوامبوونی لەو بە یەکەوە گونجان و خەسڵەتە هاوبەشانەوە هەڵدەگرینەوە، کە خەبات و تێکۆشانی کوردییان بەرجەستە کردووە. بەڵام زمانی هەڵچوونئامێز لە سروودی (ئەی ڕەقیب)دا لە بەرجەستەکردنی ژانوژوارە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانی مني (کوردی) و پەرچەکردارو دژبوونەوەکانی ئەویدیکە خۆی نابینێتەوە، بەڵکو بە جۆرێك لە جۆرەکان لە بەرجەستەکردنی نادیارانەی خودی (دڵدار) وەك تاك، کە خۆی تەماهی (کۆ) کردووە، دەردەکەوێت.

لە باسی دووەم هەوڵمداوە خوێندنەوەی سروودی (ئەی ڕەقیب) لە ڕێگەی هەردوو زمانی ڕەمزئامێزو هەڵچوونئامێزەوە وەك بنەڕەتێك لە میانی ڕێبازە نوێیەکانی ڕەخنەو بە هەر دوو ڕێبازی بونیادگەری و سیمیۆتیکادا گوزەر پێبکەم و دواجار لە ڕێبازی (پێشوازیکردن) و (وەرگرتن) درێژە بە خوێندنەوەی بدەم، لەوێشەوە لە فینۆمینۆلۆژیاوە باس لە چەمکی (وەرگر) چەمکی (پێشوازی) دەکەم و پشت بە هەر یەك لە (هایدگەر) و (گادامێر) و (یاوس) و (هۆلاند) و (ئیکۆ) و... دەبەستم و کۆمەڵێك چەمکی وەك (تێگەیشتن) بۆ (تەفسیرکردن) و (جێبەجێکردن) کردەی پەرەسەندنی (درککردن)ی (گادامێر) خراوەتە ڕوو، هەر وەك چۆنێتی پێشوازیکردنی خوێنەر بۆ ئەو بەرهەمەو چەمکی

(وەڵامدانەوەی خوێنەر) خراوەتە روو، ئەو پێشوازیکردنەش بە پێی خوێنەرەکان جۆراوجۆر خراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، هەروەها بە سوود وەرگرتن لە میتۆدە نوێیەکانی رەخنە، بۆ خوێندنەوەی (ئەی رەقیب) دەسنیشانی پێنج جۆر لە خوێنەران دەکەم.

خوێنەرێکی کوردی کە ناسیونالیزمانە بیر دەکاتەوەو لەگەڵ وزەو پەیوەندییە بەرجەستەکانی رەمزی ناسیونالیزمەوە دەکەوێتە دانوستان و چێژ وەرگرتنەوە. خوێنەرێکی ئایینی کە دەشێ (ناکوردی) بێت، دەکەوێتە بەر لێشاوی مۆدیلێکی دیکەی تێروانین و دنیابینی و بیرکردنەوەی زمانی دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی و هەمیشە لەگەڵ زمانی (ئەی رەقیب) دژ دەکەوێتەوەو گرژبوونەوەو پەرچەکردار لە یەکەمی جیا دەکاتەوە.

خوێنەری سێیەم کە چەپگەرایە وخاوەن بیروڕایەکی جیاوازو تێروانی جیاوازەو ناتوانێت لە بەدواداچوونی ماناو دەلالەتەکان بیر لە جیاوازی چینایەتی نەکاتەوەو بە چێژو خۆشی بگات.

بەڵام خوێنەری چوارەم، خوێنەرێکە هەوڵدەدات لە رێگەی وێناکردنەکانی ئیرۆسییەتی ناخی (دڵدار)و خورافاتی مێژووییەوە ئەو فەزا نادیارو شێواوو شاراوەیە کەشف بکات، کە لە تەماهیبوونی (دڵدار) بەرەو وسبەلێکراوەکانمان دەباتەوە، خوێنەری چوارەم دەشێ بەرووی دووەمی خوێنەری پێنجەم پەیوەست بکەین، رەنگە یەکێك لە جیاوازییە دیارەکانی لەگەڵ خوێنەری پێنجەم لەوەدا بێت، کە وسبەلێکراوەکان بەر لەوەی بە

نەستی (دڵدار)ەوە پەیوەست بکات، دەیلکێنێت بە(دەروونی گەل) ەوە، کەواتە خوێنەری چوارەم بۆ خوێندنەوەی سروودی (ئەی رەقیب) لە لایەك لە تەماهیبوونی (دڵدار) لەگەڵ کۆو ونبوونی دەسەلاتی (دڵدار)، وەك مرۆڤ دەردەکەوێت، لە لایەکی دیکە لە رێگەی ئەو زمانە میللیئامێزە لە پەیوەندی لەگەڵ فۆلکلۆردا دەتوانێت بناغەیەکی بە هێز بۆ نزیکبوونەوەمان لە هەستە دەستە جەمعیەکان و فۆلکلۆر نیشان بدات، لەوێشەوە بەردەوام وەك ناسنامەیەك مەیلی کوردانەی خۆی بڵاو دەکاتەوەو تەنانەت پارێزگاریش لە هەندێك دابونەریتی کوردانە دەکات. کەواتە خوێنەری چوارەم لەوێوە (ئەی رەقیب) وەك (فۆلکلۆری کوردی تەماشا دەکات، کە هەڵگری زمانێکی میللی و دەنگدانەوەو تێروانینی رابردووە.

خوێنەری پێنجەم، خوێنەری خوێنەران، ئەو خوێنەرەیە، کە هەوڵدەدات خوێندنەوەیەکی سایکۆلۆژیانە بۆ ئەو فەزا نادیارو شێواوو پەنهانە بکات، کە دەکەوێتە نێوان بێدەنگی (دڵدار)و سپێتی لاپەڕەوە.

بەشی سێیەم، چوار باس لەخۆ دەگرێت، کە هەر یەك لەو باسانە دەشێ لە ژێر کاریگەری کۆی ئەو بۆچوونانە بن، کە لە بەشی دووەم خراونەتە روو، یان بە مانایەکی دیکە لەو بەشەدا بە شێوەیەکی پراکتیکی بەشی دووەم نمایان کراوە، چوار خوێندنەوەی جیاوازم لە سەر ئەو بنەمایە خستۆتە بەر دیدەی خوێنەرانەوە. باسی یەکەم لە ژێر ناونیشانی ئەی رەقیب لە نێوان واقیع و خەیاڵدا، باسی دووەم ئەی رەقیب لە نێوان دەنگ و

دەنگدانـەوەو باسـی سـێیەم ریتمـی نـاوەوە، خوێندنەوەیـەکی فۆنۆلۆژی (ئەی رەقیب)، باسی چوارەم بونیادی جەستە لە ئەی رەقیبدا.

لـە بـەر ئـەوەی بـڕوام بـە جیـاوازی خـەیاڵو بیرکردنـەوەو بۆچوونو وێناکردنی جۆراوجۆر هەیە، بۆیە وای بە باش دەزانم لێرەو لەو پێشەکییە کورتە قسە لە هیچ یەك لەو خوێندنەوانەی خۆم نەکەم، تاکو خوێنەر نەکەوێتە دووتوێی ئاراستەکردنو بیر خستنەوەو ئازادی بیرکردنەوەو خەیاڵی لە قالب نەدرێت.

کەواتە لە میانی ئەو لێکۆڵینەوەیە شیکارئامێزەو بە پێی هەر دوو تیـۆری (وەرگـر)و (پێشـوازیکردن)و بـە پشـت بەسـتن بـە کۆمـەڵێك مەعریفـەی مۆدێرنـەوە هەوڵمانـداوە لـە رێگـەی زمـانی (ئەی رەقیب)ەوە هەستی ناسیونالی کوردی بەرجەستە بکەم، بەو مانایە ئامانجی ئـەو خوێندنەوەیە وەك گوتمـان لـە لایـەك خستنە رووی خوێندنەوەی جیاوازە، لە لایەکی دیکە نمایان کردنـی ئـەو دەنگانەیە کـە لـە بێدەنگی وشـەوە دەکەوێتـەوە، هـەر لەوێشـەوە ئەو بۆشاییەی نێوان دەنگو بێدەنگی کە تـەعبیر لە شاراوەکانو چەپێنراوەکانی شاعیر دەکات قسەو باسی لێکراوە.

لە لایەکی دیکە دەمەوێت بڵێم کۆی ئـەو وتارانـەی کـە لـە سـەر ئـەو سـروودە نووسـراونو مـن بەشـێکم لـە پـەراوێزی ئـەو خوێندنەوەیـەدا خسـتۆتە روو جگـە لـەوەی کـە نـەیانتوانیووە بـە شێوەیەکی مـەعریفی قوڵ دیـاردەی ناسیونالیسـتی بـە مێـژووی کـوردیو دەرکەوتـەکانی مێـژووی کوردییـەوە گـرێ بـدەن، نەشیانتوانیووە رەنگدانـەوەکان لـەو سـروودە بدۆزنـەوەو بیکەنـە

باسی گفتوگۆیەکی تیرو تەسەلو لەویوە بە جیهانبینییەوە پەیوەستی بکەن، بۆیە گرفتی سەرەکی بەدواداچوونی من خۆی لە کورتبینی تیروانینو بۆچوونی رەخنەی تەقلیدی کوردییەوە هەلدەگریتەوە، کورتبینی ئەو تیروانینو بۆچوونەش بە پەرگیری رەخنەگرانو دەمارگیری ناسیونالیستانەوە بەندە. بۆیە ئەوەی من لەو خویندنەوەیەدا وەك پیویست بیرم لیکردۆتەوە بیرکردنەوەو خەیالو بۆچوونی جیاوازە کە خوینەران لە ریگەی خویندنەوە دەیخەملینن.

کەواتە ئەوەی دواجار دەمەویت ریزی خۆمی بۆ بەیان بکەم ئەو فەزا ئازادەیە کە خوینەران دروستی دەکەن، هەر لەویشەوە دەشی ئەو خویندنەوەی بەر دەستتان لە لایەك ئەو فەزایە رەنگاورەنگتر نیشان بدات، وەك چۆن دەشی دەستی لە بەرهەمهینانی دژە خویندنەوەی جۆراوجۆرو دانوستانی دیکەشدا هەبیت.

کارێکی ئاسان نییه، خۆت به سه‌ر چه‌ته‌کانی ئه‌ده‌بدا بسه‌پێنیت.

(ڤۆلتێر)

## دەروازە:

دەشێ یەکێك لە پرسیارەکانی خوێنەر لە دوتوێی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا بە پرسیاری هەڵبژاردنەوە بەند بێت، پرسیاری هەڵبژاردن پرسیارێکە لە لایەك پەیوەندی بە دەق و ئاستی هونەری و زمان و یادەوەری دەق و دنیابینی دەقەوەیە، لە لایەکی دیکە ئەو پرسیارە بینینی خۆی بۆ سەر پرۆژەی خوێندنەوەکان دەگوازێتەوە، یان بە مانایەکی دیکە لە دوو تەوەردا کار دەکات، یەکەمیان بە زمانی دەقەوە بەندە، دووەمیان بە ئاستی مەعریفی راڤەکردنەکانەوە دەلکێت.

من لەم نووسینەدا دەمەوێت بڵێم ئەگەر بەشی زۆری ئاستی سروودی (ئەی رەقیب)[1] بەیادەوەری ((کۆ))و خولیای ناسیونالیزمییەوە بەند بێت، لەوێوە پانتاییەکی گەورەی بۆ ماناو دەلالەتەکان خۆش کردبێت، لەم حاڵەتەدا دەشێ بەشێکی زۆری قودسیەتەکەی بەر لەوەی پەیوەندی بە ئاستی هونەری پرسیارکردن و ئاستی مانا و چێژو دەلالەتەوە، یان ((جەستەی زمان))ەوە هەبێت، پەیوەندی بە ژانوژوارەکانی گەلی کورد ((جەستەی نەتەوە))ەوە دەکات.

کەواتە (ئەی رەقیب) بەشێکە لە جەستەی رۆشنبیری و ئاگایی و هوشیاری نەتەوەیەك، ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ

---

[1] -بڕوانە: عەبدولخالق علائەدین، هـ. س،پ، ل١٧٤.

نەتەوەیەکی دیکە، دەبینین لە زۆر رووەوە جیاواز دەکەوێتەوە، ئەو جیاوازییەش بە مێژووی کوردو شێوازی ژیان و نۆرمەکانی کوردەوە بەندەو تەعبیر لە کۆی ئەو واقیع و بەسەرهاتانە دەکات، کە کاریگەری بە سەر ژیانیاندا هەبووەو لە یادەوەریاندا بە زیندوویی ماوەتەوە، هەر لە میانی ئەو پەیوەندییە ئاڵوگۆڕییەی نێوان دەق و کۆمەڵگە (ئەی رەقیب) توانیوویەتی رۆشنبیرییەك وێنە بکات، کە کۆمەڵگە لە کۆدەکانیدا بەشدارە، هەر لەوێشەوە جۆرێك لە سێنترالیەت بۆخۆی بسازێنێت.

بەلاّم من دەمەوێت قسە لە هونەری نووسین بکەم، هونەری نووسینیش هونەرێکی گشتی نییە، هونەرێکە بە داهێنەرەوە بەندە، هونەرێکە تەعبیر لە دنیابینی و ئیستێتیکاو چێژ دەکات، تەعبیر لە رەهەندەکانی دەلالەت و مانا جیاوازەکان دەکات، هەموو ئەوانەش بە ئازادی تاك و خودی تاکەوە بەندە، هەروەها خودی سەربەست و ئازاد لە تاکەوە لەدایك دەبێت، ئەو مێژووە تایبەتەی کە تەعبیر لە ئاستی رۆشبیریی و گەیشتن و ئارەزووە چێژئامێزو هەلاّیساوەکانی تاك دەکات، واتە داهێنان بەر لەوەی پەیوەندی بە ((کۆ))و باری چینایەتیەوە هەبێت، لە مەعریفەو ئەزموونی داهێنەرانەوە هەڵدەقوڵێت، نەك هەر هێندەش بەڵکو ئەسڵەن ناتوانین لە دوتوێی مانا دیاریکراوەکانی کۆو باری چینایەتییەوە، بە ئاسانی بە دوای خودی تاك و سەربەخۆی تاکدا بڕۆین.

واتە ئەگەر نەتوانین سێنترالییەتی سروودی (ئەی رەقیب) بە ئاستەکانی شیعرییەت و پرس و دنیابینییەکەیەوە پەیوەست

بکـەین، نـەتوانین لـە ئیبداعـەوە هەڵگرینـەوە، دەکرێـت لـەتوێی جەسـتـەی نەتـەوە، یـان ئـەو پەیوەندییـە کۆمەڵایـەتی و ئایـدیۆلۆژی و سیاسیانەوە سەیری بکـەین، کـە لـە نێوان دەق و عەقلانیەتی کۆمەڵگە، دەق و بیرکردنەوەی نەتەوە دێتە ئاراوە. بە مانایـەکی دیکـە مەڵبەنـدێتی (ئـەی رەقیـب) لـەو حاڵەتـەدا دەشـێ تـەعبیر لـەو ژانـوژوارو پەرچـەکردارانە بکـات، کـە لـە هـەناوی نەتەوەو کۆمەڵگەدان، یان لە توانەوەی تاك لە نێو ((کۆ))دا خۆی دەدۆزێتـەوە، بـەو مانایـەش دەق لـە دەقێکـی ئیبـداعی و فەردانییـەوە بـۆ دەقـی ((کـۆ)) خـۆی دەگوازێتـەوە، مەڵبەنـدێتی دەقـی ((کـۆ))ش لـەوێوە دێ، کـە دەشـێ بـە شـێوەیەکی تایبـەتی تـەعبیر لەبەیەکـەوە گونجـان و هاوتـەبایی عـەقڵی و رۆشـنبیریی و نەتەوەیی و ئایینی و فیکری و مـەعریفی و ئیتنی بکات، هەست و نەسـت و جیـاوازی شـێوازی ژیـان و کـەلتوورو نـۆرمی نەتـەوەی کـورد بخاتـە روو، لەوێشـەوە هـەر یـەك لە تاکـەکانی کۆمەڵگە لـە دەلالەت و ژانوژوارو پەرچەکردارەکانی ئەو دەقەدا بەشدارە.

لێـرەدا ژیـانی ئـەو دەقـە دەبێتـە ئاوێنـەی قۆنـاغێکی دیـاریکراوی دەلالـەت و ژانوژوارەکـانی کۆمەڵگـە، وەك چـۆن کۆمەڵگەش بۆ هـەمان قۆنـاغی دیـاریکراو دەبێتـە ئاوێنـەی دەقـی نـاوبراو. هـەر لـە سـەر ئـەو بنەمایـە دەتـوانین بڵـێین مەڵبەنـدێتی سـروودی (ئـەی رەقیـب) بـەر لـەوەی بـە تـاکی شـاعیرو خـەیاڵ و ئازادییەکانی نووسین و خودەوە بەند بێت، راستەوخۆ لە بینینی ((کۆ))و راڤەکردن و شیکردنەوەی دنیای واقیعی و دنیای رۆحـی و ئەو وێنـەو دەلالـەت و پاشماوانـەی، کە گـەل و نەتـەوە پارێزگـاری

لێـــدەكات خـــۆی دەنوێنێـــت، ئەگەرچـــی رەنگـــە بـــە پێـــی بەرەوپێشچوونی دنیا هیچ بەشێك لە پێشكەوتنی بەر نەكەوێت، بـــەڵام وەك پاشمـــاوەو هەســـتو نەســـتو نـــۆرمی كـــوردی پەیوەندییەكی توندو قووڵی بە منی كوردییەوە هەیە.

كەواتە ئەگەر یەكێك لە مەرجەكانی قودسیەتی سێنتراڵییەت پەیوەندی بەو دەلالەتو یادەوەریو وێنەو ماناگەلەوە هەبێت، كە بە ((دەوروبەر))، واتە راڤەكار[2] و راڤەكردنە رۆشنبیریی و

---

[2]-لێرەدا دەتوانین كۆمەڵێك لە راڤەكارە تەقلیدییەكانی شیعری دڵدار ریز بكەین، تەقلیدی بەو مانایەی كە نەیانتوانیووە خوێندنەوەیەكی بەرهەمهێنەرانە بخەنە روو، خوێندنەوەیەكی قووڵ كە نهێنی جوانكاری و ئیبداعی هونەری و مانای شیعری و شیعرییەت بەرجەستە بكات. من هەر تەنها چەند نموونەیەك دەخەمە روو، دەشێ خوێنەر لە رێگەی سەرچاوەكانەوە بە دوای نموونەی دیكەدا بچێت:- ١-رەفیق حیلمی دەڵێت: ئەو شیعرانەی كە باس لە هەندێ لایەنی كۆمەڵایەتی و نیشتیمانی ئەكا و چارەسازی ئەمان پێشان ئەدا هەروەكو لە لایەن بیرەوە پوختن و بە كەڵكن لە نیگای ئەدەبیشەوە پەسەندن. (بڕوانە-گۆڤاری گەلاوێژ ژمارەی ئەیلول /١٩٤٣). ٢-عەزیز گەردی دەڵێت: دڵدار كە هەناسەی هەڵدەكێشا، هەوای سەربەستی ئەچووە دەمارەكانیا، كە ئەیدایەوە گڵپەی ئاگرێكی لە ناخەوە ئەهاتە دەرەوە، دوژمنی دەسووتاند، هاونیشتیمانی لە خەو رائەپەراند.( بڕوانە/گۆڤاری هەولێر -ژمارە -٤،٥- سالی یەكەم ١٩٧١ ل١٨). ٣-دكتۆر مارف خەزنەدار دەڵێت: ئەی رەقیب بووە سروودی مارسێلێزی كورد. (بڕوانە -كۆیەو شاعیران- كەریم شارەزا ل ٨٠).٤-ممتازی حەیدەری دەڵێت: دڵداری شاعیر هەڵبەستەكانی وێنەی ژیانی میللەتەكەیەتی، دڵسۆزی خۆی بۆ گەل ئەنوێنێ، سروودی سەركەوتنی بۆ

کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە دەلکێت. ئەویدیکە پەیوەندی بەو شاراوە مەعریفی و رۆشنبیرییەوە هەیە، کە لە پێشتر ماوەتەوە، یان بۆمان ماوەتەوە. بەڵام خاڵی سێیەم لەوێوە پەیوەندی بە قودسییەتەوە نییە، کە لە خودی خۆیدا خاڵێکی نادیارو پەنهانە، دەشێ هیچ وجودێکی لە دنیای واقیعو حەقیقەتدا نەبێت، وەك چۆن دەشێ پەیوەندی بەو وزە شاراوەو تایبەتەوە هەبێت، کە پاسەوانی رۆحی شاعیر دەکات. ئەو خاڵە پەنهانە دەشێ راستەوخۆ لە خەیاڵدانی جۆرێك لە خوێنەران هەبێ و ئەسڵەن ((پاشماوە))و ((دەوروبەر)) کەمتر بە لایدا بچن، وەك چۆن نە پاشماوە بیری لێدەکاتەوە، نە دەوروبەر بیری لێدەکاتەوە، نە هەوڵی کەشفکردنیشیان لا مەبەستە. من بە پێی توانا هەوڵدەدەم لەم نووسینەدا پەنجەرەیەك بە سەر ئەو خاڵەدا بکەمەوە.

لە لایەکی دیکە لە بیرمان نەچێت خوێنەرو راڤەکارانی سروودی (ئەی رەقیب) بەر لەوەی وەك هونەرو زمان قسە لەو

---

ئەڵێ. (بڕوانە/دەفتەری کوردەواری/ژمارە١٣). ٥-کەریم شارەزا دەڵێت: دەتوانم بڵێم دڵداری شاعیری نیشتیمانپەروەر یەکەم کەس بوو کە مەشقی خەباتی نیشتیمانی و کوردایەتی بۆ دادام. (بڕوانە/بیرەوەرییەکانم لەگەڵ دڵداری شاعیرو تێکۆشەر/ رۆژنامەی هاوکاری ژمارە -٣٠٥-ی ١٩٧٦/٢/٢٠). ٦-کەمال غەمبار دەڵێت: دڵدار دێتە سەر ئەو باوەڕە کە خەیاڵ هەرچەندە دوورکەوێتەوە لە سنووری واقیع دەرناچێ، کەواتە جەوی فانتازی هیچ شتێك لە واقیعەکە ناگۆڕێ و دەرگاکانی کۆمەڵ دەست نیشان ناکات، دەبێ شیعر بۆ نەتەوەکەی بڵێ .(بڕوانە/ رۆژنامەی پاشکۆی عیراق/ژمارە-٢- ل٦). هێڵەکانی ژێر رستەکان لە لایەن ئێمەوەیە.

سـروودە بکـەن، وەك وێنـەی لـە خاچـدراوی نەتـەوەو دروشمـی نەتـەوەیی و ئاوێنـەی ژانوژوارەکـانی کۆمەڵگـەو ئـاڵای نەتـەوە بەرزیان کردۆتەوە.

بە کورتی ئـەوەی لـەو چـەند دێـرە مەبەستمە ئەوەیە، کـە لـە هەڵبـژاردنی سروودی (ئـەی رەقیـب) لـە لایـەك دەمـەوێت قسـە لـە سـەر مەڵبەنـدێتی سـروودەکە بکـەم، بـەو مانایـەی کـە بەگشـتی ((کـۆ)) دەسـتی لــە بەرجەسـتەکردنیدا هەیـەو بـە تایبـەتیش راڤەکارە ناسیونالیست و ئایینی و چەپەکان و دژەکانی دیکـە، لـە لایـەکی دیکـە مەبەسـتمە وەك سیسـتەمی زمـان بـەدوای هونـەری نووسـین و ئاسـتی نووسـینەوەیدا بچـم. بەشـی یەکـەمیان لـەو بڕوایەوە دێت، کە (دڵدار)[٣] نەیتوانیووە هونـەری پرسـیارکردن بە

---

[٣]– (دڵدار):ناوی (یونس)ی کوڕی مەلا رەئوف کوڕی مەحموودی کوڕی مەلا سەعدی خادم السجادەین لە لە رۆژی ٢٠ی شوباتی ١٩١٨ لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە..دایکی ناوی زەهوەی کچی خورشید ئەفەندییە، فەمیلیای دایکی عەلەم زادەن و لە زەهاوەوە هاتوونەتە قەراغ زێی کۆیە، حاجی قادری کۆیی لەو فامیلیایەیە. لە بەر ئەوەی کە ئەم وڵاتە لە دەستی تورکەکان دەیناڵاند و حکومەتە نەخۆشەکەی تورکیاش بە هۆی ئەوەوە کە لە شەڕی یەکەمی جیهانی شکابوو، ئیتر هەموو لایەکی خەڵکی کوردستانیش گیرۆدەی دەستی شەڕوماڵوێرانی ئاوارەیی تاڵان و بێکاری و نەخۆشی.... ببوەوە. لە تەمەنی سی(٣٠) ساڵیدا لە رۆژی١٢/١١/١٩٤٨ لە شاری هەولێر کۆچی دوای دەکات. بڕوانە:– دڵدار شاعیری شۆڕگێڕی کورد–عەبدولخالق علائەدین/ه.س.پ.ل١٢/١٤.

کاکەی فەلاح لە بارەی (دڵدار)ەوە دەڵێت: بە پێی شیعرەکانی ناو دیوانە چاپکراوەکەی، سەرەتا لە سەر پێودانی شیعری کلاسیکی و یەکێتی کێشی

جۆرێــك بەرجەسـتــە بكــات، كــە بێتــە هونــەری بیركردنــەوەی بــەردەوام، ئــەوەش بەشــی زۆری پەیوەنــدی بــەو تێــڕوانین و حەقیقەتــە ناسیونالیســتەوە هەیــە، كــە ڕووی هــەرە دیــاری سروودەكەی لەخۆدا گرتووە. بەشی دووەمیان وەك خوێنەرێك بە پێــی توانــا هەوڵــدەدەم لــە ڕێگــەی ((وەســتان)) و خاڵــە (نادیار)ەكانییەوە قسە لە سیستەمی زمانی (ئەی ڕەقیب) بكەم، دوو جۆر بێدەنگی دەستنیشان بكەم كە ڕاستەوخۆ بە حاڵەتی نووسین ((هەستی دەروونی)) و سپێتی لاپەڕە ((وەستان))ەوە بەندە.

بـۆ ئـەو مەبەسـتە دەتـوانین بڵـێین:- بێـدەنگی وەسـتانە لـە دەربـڕین، چ بـە ناچـاری، چ بـە ڕەزامەنـدی، بـە مانایـەكی دیكـە بێـدەنگی دەكەوێتـە بەرامبـەر دەسـەڵاتی دەنـگ. كاتێـك دەڵـێین دەكەوێتـە بەرامبـەر دەربـڕین، یـان گـوتن، یـان دەسـەڵاتی دەنـگ، دەبێ بزانین كە (گوتن هەر تەنها ڕەهاكردنی كۆمەڵێك دەنگ نییە،

---

عەرووزی شیعری چنیووە. بەلای منەوە زۆرتری ئەو چەشنە شیعرانەی بە شێوەی هۆنراوە واتە نظم هۆنیوەتەوە، تێكرا شێوە راستەوخۆی خیتابی و ئامۆژگاری كردن و ڕێگا پێشاندانی زەق و چاو كردنەوەیان پێوە دیارە. لەو شیعرانەدا زۆرتر پەیرەوی (حاجی قادری كۆیی) كردووە، كە تەنها مەبەستی دەربڕین و كارتێكرنی بیروباوەڕەكەی بووە، بێ ئەوەی گوێ بداتە شێوەو زمانی شیعرەكان. (بڕانە كاروانی شیعری نوێی كوردی بەرگی یەكەم ل١٠٢-بەغداد ١٩٧٨).

بەڵكو بازاڕێكە بۆ بەرهەمهێنانی مانا، ئەوەش بۆ دەسەڵاتە كۆمەڵایەتیە جۆراو جۆرەكان دەگەڕێتەوە)[٤].

لێرەدا قسە لە ((داخران)) ناكەم، چونكە هیچ كارێك كە لە زمان دێتە بەرهەم داخراو نییە، وەك چۆن هیچ دەقێك نییە هەموو ئەوەمان پێبڵێت كە دەیەوێت. دەق لەوێوە داخراو نییە، كە زمان هەڵگری ماناو دەلالەتو مێژووو یادەوەریو خەیاڵی خۆیەتی، هەروەها گرنگ دەست خستنە سەر مانا مەجازییەكان نییە، بەڵكو گرنگ ئەوەیە پشت ئەو ماناو گوتارو پشت ئەو وشانە ببینین، لە پشت ئەوانەوە دەق دەیەوێت چی بڵێت.

بەلأم لە بیرمان نەچێ ((كرانەوە)) لە رووی ئەدەبییەوە هەڵگری كۆمەڵێك ئاستو جیاوازی جۆراو جۆرە، ئەو رستەیەش بەرەو دوو جۆر لە نووسینمان دەكاتەوە، یەكەمیان: (یەكە) ئامادەكراوەكانی زمان لەخۆ دەگرێت، تێروانینی سیاسیو كۆمەڵایەتی كۆو مانا باوەكانی لەخۆدا هەڵگرتووە. دووەمیان داهێنەر بە شێوازی تایبەتی خۆیەوە ئەو (یەكانە) بەرهەم دینێتو هەڵگری كۆمەڵێك رەهەندی مەعریفیو ئاستی ئیستێتیكیو دەلالی جیاوازە.

یەكە ئامادەكراوەكان لەوێوە داخراو نیین، كە لە هەناوی ((كۆ))ەوە ئامادەكراون، وەك چۆن بەرهەمهێنانی یەكەكانیش لەوێوە وەك كاری ئیبداعی تەماشا دەكرێن، كە لە شێوازێكی

---

[٤]-بڕوانە: ابراهیم محمود/ جمالیات الصمت في اصل المخفي و المكبوت- مركز انماء الحضاري-دیمشق/ط۲۰۰۲،۱-ل١٧٤.

تایبەتییەوە هەڵقوڵاون و لە جیاوازییەوە خۆیان بەرجەستە دەکەن.

کەواتە ئەو نێودژییەی کە دەکەوێتە نێوان (بەدواداچوون)و (بەدوادانەچوون) لە لای من، لە لایەك پەیوەندی بە ئاستەکانی نووسین و چەمکی نووسینەوە هەیە، لە لایەکی دیکە لەوێوە دێت کە بڕوام بەوە نییە (ئەی رەقیب) لە ناخی خۆیەوە خاوەنی ئازادی گوتن و ئاستی بەرزی جوانگوتن بێت و لە رێگەی درەوشانەوەوە سنوورەکانی بڕیبێت و مانا و دەلالەتی دیکەی نوێی بەرهەم هێنابێت. ئەو رستەیە لەوێوە دێت کە داهێنان ((تاك)) پێهەڵدەسێ، نەك ((کۆ))، داهێنان لە ئازادی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنی تاکەوە هەڵدەقوڵێت، نەك لە ژێر دەلالەتە تۆتالیتێرەکانی دەسەڵاتی سیاسیانەی نەتەوەو تێڕوانینی کەڵەگایانەی کۆمەڵگەوە.

بە دیووەکەی دیکە لەم نووسینەدا هەوڵدەدەم لە رێگەی بەدواداچوونی مەڵبەندێتی و تەوەرەی راڤەکارانییەوە، کە دەستی زۆری تێڕوانینی ((کۆ))و دەسەڵاتی سیاسیانەی نەتەوەی تێدایە، ئەو قودسیەتە تێکبشکێنم، کە بە سروودی (ئەی رەقیب) دراوە، ئەو هەوڵەش بە راڤەکردن و لێکدانەوە جۆراوجۆرەکانەوە پشتراست دەکەمەوە، واتە بەر لەوەی وەك دروشم و پرۆپاگندە ئەو تێکشکانە بەرز بکەمەوە، لە میانی ئەم نووسینەدا هەوڵدەدەم ئیشکالەکانی خوێندنەوە دەستنیشان بکەم.

زمان قسان دەکات نەك نووسەر، نووسین گەیشتنە بەو پنتەی کە زمان بێتە گۆ، نەك من.

مالارمێ

# بەشی یەکەم

## باسی یەکەم

### ستراتیژیەتی دەق

دەق بە پێی باکگراوەندی فیکری و فەلسەفی هەڵگری کۆمەڵێک پێناسەی جیاوازە. (ژۆلیا کریستیڤا) دەڵێت:– دەق بە گشتی ناچێتە سەر رەچەڵەکی زمان، بەڵکو لە مەسەلەی ئەسڵی زمان خۆی دەرباز دەکات و لە میانی پانتاییەکانی دەقدا بە هەڵکۆڵینی هێلێکی ستوونی هەڵدەستێت، لەوێشەوە بە نموونەی دەلالەتەکان دەگات، کە زمان لە حاڵەتی وێنەگرتن و گەیاندن نەیتووانیووە بیگەیەنێت، ئەگەرچی وا ناونراوە[5].

لێرەدا نەچوونە سەر ئەسڵی زمان بەو مانایە دێت کە دەق بەردەوام لە نێو زماندا لە کەشفکردندا خۆی هەڵدەگرێتەوە، لەوێوە دەشێ هەموو ئەو ماناو دەلالەتانەی لەخۆ حەشار دابێت، کە وەك باکگراوەندی مەعریفی و سۆسیۆلۆژی و دەروونی و مێژووی خۆیان دەنوێنن. کەواتە ئەگەر لە لایەك نەچوونە سەر ئەسڵی زمان تەعبیر لە دارووتانی زمان بکات و لەوێوە (داهێنان) زمان بدوێنێت، ئەوە بە دیووەکەی دیکە نەچوونە سەر ئەسڵی زمان خۆ لادانە لەو باکگراوەندە، نەك لە پێناو لە بیر کردن بەڵکو لە پێناو دووبارە بە بیر هێنانەوەو چێژەوە. کەواتە خۆلادان

---

[5]. جوليا كريستيفا–علم النص– ترجمة:فريد الزاهي/مراجعة:عبدالجليل ناظم/دار توبقال للنشر ل٨.

لێــرەدا بــە قــەد ئــەوەی مانــای بــە بــیر هێنانــەوەو چــێژو بونیادنانەوەیــەکی دیکــەی جیــاواز دەنوێنــێ ئەوەنــدە لایەنــە نێگەتیفەکە جێبەجێ ناکات.

هەر لێرەوە دەتوانین بڵێین نەچوونە سەر رەچەلەکی زمان وەك چــۆن بــە بــیر هێنانــەوەی باکگراوەنــدی زمانــە، بــە دیووەکــەی دیکــەش ســەرەتایەکی دیکــەی دەســتپێکردن وازی دەکــات. بــەو مانایە دەشێ هــەر دوو رووەکــەی نەچوونەوە بــۆ ســەر رەچــەلەکی زمان تەعبیر لە ناکۆتای جیاوازییــەکان بکات ئەو جیاوازییانــەی کە پێکهاتەیەکی بێ سنوور دەنەخشێنێن، یان بە مانایەکی دیکە دەشــێ بڵــێین دەق هــەڵگری ئــەزموونی زمانــە، لەوێشــەوە پــرس و گومانە باوەکان تێکدەشکێنێت و راڤەکردنێکی دیکەی جیــاواز بە پەیوەندییەکان دەبەخشێت.

کەواتــە زمــان لــە دەقــی ئەدەبیــدا لــە رێگــەی زەمــەن و شــوێن و مێژووەوە وەك بوونەوەرێکی جوڵاو دێتــە نــاوەوە، هــەر لەوێشــەوە داهێنــەر دەتوانێــت زەمــەن و شــوێن و مێــژووی تایبــەت بــەخۆی بخاتــەوە، بــەو مانایــەش هــەر چــەندە زمــان قــوڵتر خــۆی بنوێنــێ و ئەزمووندارتر بێــت، مانــاو دەلالەتــەکانی زێــترو بــەرفرەوانتر دەبــن. بەڵام ئەگــەر باکگراوەنــدی زمــان جۆرێــك لــە ((جێگیربوون)) لــەخۆ بگرێــت نووســەری داهێنــەر لــەوێوە ((جێگیر-نــەبوون)) پراکتیــزە دەکات کە داهێنان لە دڵەڕاوکێ نابێتەوە.

کەواتە قسەکردن لە ســەر داهێنــان بەشێکی زۆری قســەکردنە لەســەر دەلالەتــە جێگیرنــەبووەکانی زمــان، لێــرەدا دەتــوانین بڵــێین دەق لە دەنگدانەوەی ئاستە پەنهان و جیا جیاکــانی گوتنــدا خــۆی

هەڵدەگرێتەوە، یان بە مانایەکی دیکە لە دەستکاریکردنی گوتن خۆی وازی دەکات، بەڵام کاتێك گوتن دەتوانێ دەق وێنە بکات، کە دەربڕی ئازادییەکانی خۆی بێت، کە بتوانێت نەگوتراوو ئاستە جیاوازییەکانیان بەرجەستە بکات، ئەوەش راستەوخۆ بە پرۆسەی خزینی زمانمان پەیوەست دەکاتو دەکەوێتە دەرەوەی گەیاندنو دەلالەتکردنەوە، بەڵام نەك بەو مانایەی کە نکوڵی لە گوتراوەکان بکرێت، لەو حاڵەتەدا گوتراوەکان دەبنە بەشێك لە یادەوەری دەقو چینێك لە چینەکانی ماناو دەلالەت، لێرەدا دەق وەك (بارت) دەڵێت: نە کۆنترۆڵکردنەو نە ئیستهلاککردن، بەڵکو هەوڵدانە بۆ خۆ والاکردن[٦].

کەواتە دەقی ئەدەبی بونیادێکی کراوەیەو قابیلی چێژو دامەزراندنی بەردەوامە، یان بە مانایەکی دیکە لەبەر ئەوەی کراوەیە بۆیە دەشێ هەڵگری خوێندنەوەی بەردەوام بێت، بەڵام وەك گوتمان ((کرانەوە)) ئاستی جیاوازو رەهەندی جیاواز لەخۆ دەگرێت، چونکە ئەگەر یەکەمین کەرەسەی دەقی ئەدەبی زمان بێتو لەوێوە ((کرانەوە)) بتوانێت بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆی بسەپێنێت، دووەمین کەرەسەی دەقی ئەدەبی جوانگوتنە، وەك چۆن ئاستی سێیەمیش میکانیزمی کارکردنە، یان چێگوتن. چێگوتن ئەو بونیادەیە، کە ئاستو چینی دەمەتەقێئامێزی لەخۆ گرتووە، هەر لەوێشەوە بە خوێنەران دەگات.

---

[٦]. عەبدولموتەلیب عەبدوڵلا، ئاگایی زمان زمانی ئاگایی– چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی /١٩٩٩.ل ٦١.

چـیگوتن هــەڵگری خوێندنــەوەو لێکدانــەوەو راڤــەکردنی جیاوازەو خوێنەرو ئاستی خوێندنەوەی جیاواز لەخۆ دەگرێت، بــە مانایــەکی دیکــە پانتاییــەکی کراوەیــە بــۆ دەمەتــەقێ و ئاڵوگۆڕکردنی جیاوازییــەکان، ئــەو ئاڵوگۆڕکردن و قبوڵکردنــەش ئەگەر بەشێکی پەیوەندی بە زمان بکات، بەشێکی پەیوەندی بە چۆنگوتن وجوانگوتنەوە هەیە، وەك چۆن بەشێکی دیکەشی لە سەر ئەو بونیادە دەوەستێت کە داهێنەر دەیخاتەوە.

نابێ لە بیرمان بچێت بەتەنها مەدلولی زمان ناتوانێت هەڵگری پێناسەکانی دەق بێت، ئاستە جیاوازەکانی دەق بنەخشێنێ، بەو مانایەش لەوێوە قسە لە مەدلولی زمان دەکەین کە بە هەڵکۆڵینی هێڵێکی ستوونی هەڵدەستێ، ئەو هێڵەش کەشفی ماناو مەدلولی رۆشــنبیریی و چـێژو جـوانی و دنیـابینی و ئاسـتی بـەرز گـوتن دەکات، لێرەدا ئەگەرچی چیگووتن و چۆنگووتن گرنگی تایبەتی خۆیـان لـە فـرە رەهەنـدی و بـەرزگرتنی ئاسـتی زمـان و دەلالـەت و دەسەڵاتی خوێندنەوەو جیاوازییەکاندا دەنوێنن، بەڵام لـە بیرمـان نەچـێت هــەرگیز ئــەوە مــەرجی هاتنــەوە لەگــەڵ راســتییەکان ناخاتــەوە، بــەڵکو مــەرجی گومـان و پرسـیارە جۆراوجۆرەکـانی لــەخۆدا حەشـار داوە، دەلالــەت لــەوە دەکـات کـە چـەند توانـای تەجاوزکردنی شتە باوەکانی پێیە، بە دیووەکەی دیکـەش چەند دەتوانــێ هــەڵگری ئاســتە بــەرزەکانی زمـان و ئیسـتێتیکاو چـێژو مەعریفە بێت، ئەوەش هەروەك چۆن دەشێ بە شێوازی گوتن و پێکهاتــەی رســتەو ئاســتی فیکــری و مــەعریفی و دەلالەتــەوە

پەیوەستی بکەین، بە دیووەکەی دیکە دەشێ بە نواندن و چێژو دروستکردن و داهێنانەوە بەند بێت.

واتە ئەگەر دەقی ئەدەبی خۆی لە نێو وزەو هێزە دەلالەت ئامێزە نەگوتراوو شاراوەکانی چیگوتن و چۆنگووتن حەشار دابێت، لەوێوە بتوانێت خۆی لەنێو زمان و ئاستە جیاوازەکانی رۆشنبیریدا بدۆزێتەوە، و بە دینامیکیەتی خۆی فەزایەك بێنێتە ئاراوو بتوانێت لەو فەزا رەنگاو رەنگەدا بە شێوەیەکی بەرجەستە خۆی بنوێنێ، ئیتر هەر لەوێشەوە دەتوانێت زەمەنەکان ببرێت و بە ستوونی دابەزێت و ئاسۆیەك لە چاوەڕوانی تایبەت بەخۆی بخاتەوەو ئامادەگی خۆی بەرجەستە بکات.

لە نێوانی چیگوتن و چۆنگوتن، لە نێوانی زمان و ئاستەکانی خەیاڵ و فیکرو مەعریفە، لە نێوانی ئیستێتیکاو چێژ، دەشێ ئاماژە بە ژانرەکان بدەین، وەك چۆن لە نێوان دەسەلاتی رۆشنبیریی و دەسەلاتی خوێنەردا دەشێ ئەو چاوەڕوانییە بخوێنینەوە کە دەق دەیخولقێنێ، بەلام وەك چۆن مەرجی چیگووتن و چۆنگووتن بە ئاستەکانی زمان و رۆشنبیریی و فیکری و مەعریفییەوە بەندە، بە هەمان شێوەش مەرجی ئەو فەزا رەنگاو رەنگەی کە دەق لە چاوەڕوانی خوێنەر دروستی دەکات، ئاستی هوشیاری و ئازادی و جیاوازییەکانی خوێنەری لەخۆدا هەڵگرتووە.

لێرەدا دەکەوینە دوتوێی سیانەی مەرجەع و بونیادو بۆچوونی فەلسەفیەوەو هەر لەوێوە دەشێ چەمکی دال و مەدلول دیاری بکەن.

ئەگــەر وایــدابنێین کــە دەق بــەر لــەوەی بــە خوێنــەر بگــات، یەکەیــەکی فیکــری‌و ئیســتێتکی‌و مــەعریفی ســەربەخۆی لــەخۆ حەشــار دابێــت، لەگەیشــتنی بــە خوێنــەر یەکەیــەکی فیکــری‌و مــەعریفی‌و ئیســتێتیکی نــوێ بــە نــاوی فــەزای خوێندنــەوە دابمــەزرێنێ، ئــەوە نووســین لــەرووی دەربڕینــەوە نوێنەرایــەتی سیســتەمی مەعریفــە دەکــات. هــەروەك ئــەو فەزایــەی کــە بــۆ خوێنــەریش دروســت دەبــێ فەزایەکــە هــەڵگری کۆمــەڵێك ئاســت‌و دەریچــەو خــەیاڵ‌و یەکــەی مــەعریفی جیــاوازو فــرە رەهەنــد، فەزایەکی دەمەتــەقێئامێزە، دواجار توانــای قبوڵکردنی خوێنــەرو خوێندنــەوەی جیــاوازو مانــاو بــیرو بۆچــوونی جیــاوازو ئاســتی مــــەعریفی جیــــاوازی پێیــــە، فەزایەکــــە قــــابیلی تەقینــــەوەی جۆراوجۆری ماناو خەیاڵ‌و ئیستێتیکاو پرشنگی جۆراوجۆری زمانــەوانی‌و فیکــری‌و مــەعریفی چــێژئامێزە. بــەو مانایــەش رەهەندی نووسین‌و خوێندنەوە رەهەندی ئاماژەو مانــاو رەهەنــدی ســیمەی جیــاوازە، هــەروەها هــەر لــەوێوە دەتــوانین لــە رێگــەی تانوپۆکــانی دەقــەوە چــەمکە (دەلالــی-ئامــاژەیی)و (مــەدلول-ســیمە)ەکــانی دیــاری بکــەین، وەك چــۆن لــە رێگــەی خوێنــەرو خوێندنەوەوە دەشێ بەشداری لە داهێنانی یەکەکانی ئەو دەقــەدا بکەین.

ئەگــەر بتــوانین بڵــێین مەرجــەع لــە تێگەیشــتنی زمانەوانیــدا پانتاییەکی بەرفرەوان لە رستەو دەستەواژەو چەمکە فیکریــەکان دادەمەزرێنێ‌و لەوێشەوە پێناسەی مەعریفی بۆ دەق دەخاتــەوە، ئەوە هەر لە سەر بنەمای ئەو مانایەوە دەشێ بڵێین مەرجەع لە

دەسەڵاتی دەقدا (ڕەنگدانەوەی) پێکهاتەی مەعریفی و فیکری و کۆمەڵێك چەمك و پەیوەندی و خەیاڵ و بۆچوونی ئەو نووسەرەیە کە نوێنەرایەتی بەرهەمهێنانی دەکات[7].

لە بەرامبەر ئەوەش سیستەمی (بۆماوە) لە دەسەڵاتی خوێنەردا، یان بە مانایەکی دیکە خەزینی ڕۆشنبیریی خوێنەر ڕەنگدانەوەی هەمان ئەو چەمکگەلەیە کە خوێنەر لە خوێندنەوەو ڕاڤەکردن و لێکدانەوەدا دەیخاتەوە.

لێرەدا دەبینین بۆ تێگەیشتنی دەق دەکەوینە پرۆسەیەکی بەرامبەرکێوە، یان بە مانایەکی دیکە پرۆسەی (دان)و (خواستن) خودی پرۆسەی ناوبراویش نوێنەرایەتی بە یەکگەیشتنی خوێنەرو دەق دەکات، ئەو بەریەککەوتن و بەیەکگەیشتنەش لە میانی چۆنیەتی و ئامادەیی تەواوی حاڵەتەکاندا ئەتمۆسفێرێکی هاوبەش بۆ خوێندنەوە دادەمەزرێنێ، وەك چۆن بوونی خۆیشی لەو ئەتمۆسفیرە سەربەخۆیەدا هەڵدەگرێتەوە، هەر بەو مانایەش چەمکەکانی (خوێنەر-دەق) لە بەیەکداچوونی فیکرو خەیاڵ و چێژو مەعریفەوە مەرجەعیەتێك بە تەسەوری خوێندنەوە دادەمەزرێنێت، بەڵام لەبیرمان نەچێت ویستی ئازادانەی خوێنەر لە ڕێگەی چەمکی جیاوازییەوە کار لە هەڵوەشانەوەی بۆچوونی

---

7. عەزیز ئەلتەمیمی، (سیستەمی خوێندنەوەو دەسەڵاتی ئەزموون) ڕۆژنامەی (الزمان) ژمارە ١٥٦٨ دوشەممە٢٨/تەمموزی ٢٠٠٢.

مەرجەعی و (ژینگە–دەورووبەر)ی دەق و شیکردنەوەی چەمکە رەفتار ئامێزە فەلسەفیەکان دەکات.

لە خوێندنەوەدا هەموو تانوپۆیەك لە تانوپۆکانی دەق لە ئامادەیی و تەسەوری دیاریکراوی خوێنەردا بەشداری خۆی دەنوێنێت. ئەوەش ئەگەر بەشێکی بۆ مەرجەعیەت بگەڕێتەوە، بەشێکی بۆ ئامادەیی (دەورووبەر)و حاڵەتی دەروونی و هوشیاری و ئاگایی و خەیاڵ و وێرای ئەوانەش جەربەزەیی و سەرکێشییەکانی خوێنەر دەگەڕێتەوە، یان بە مانایەکی دیکە ئەگەر سەرچاوەی مەعریفی لە تۆمارکردنی چەمك و پەیوەندییە سیاسی و مەعریفی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و رەفتار ئامێزەکان بەشداری بکات، دەشێ هەموو ئەو بەهاو دەستەواژانە لە خۆبگرێت کە باکگراوەندی مەعریفی دەقیان لەسەر بونیاد نراوە، لەوێشەوە دەتوانین ئاماژە بە کرۆکی دەسەلاتی دەق بکەین، وەك چۆن گوتمان بەشێکی دەبێتە کرۆکی دەسەلاتی خوێنەریش، ئەو دەسەلاتەش لەوێوە دەست پێدەکات کە پەیوەندی بە رێبازەکانی خوێندنەوەوە دەکەین و دەکەوینە دوتوێی تیۆری وەرگرو تیۆری پێشوازیکردنەوە.

لە لایەکی دیکە پۆرتریتی چەمکی دەقی ئەدەبی لە رێگەی زمانەوە خۆی نمایان دەکات، ئیتر دەبێ بە جۆرێك لە جۆرەکان بڕوامان بەوە هەبێت، کە خەسڵەتی سەرەکی زمانی ئەدەبی بە مانا تازەکەی ئەوەیە کە (یاریکردن) لە نێویدا کراوەیە، هەر لەوێشەوە خەسڵەتی دەق بە مانا (بارت)ییەکەی بە چێژو

ئیستێتیکاو دنیابینییەوە بەندە[8]، وێڕای ئەوەش یاریکردن لە نێو ئەو بۆشاییەی کە خوێنەرو دەق بەیەکەوە دەگەیەنێت بە کراوەیی دەمێنێتەوە، چونکە وەك گوتمان فەزایەکە ئازادی ڕەنگ دەکات، ئەو فەزایە ئازادەش دەشێ بە خەیاڵ بچوێنین لەوێوە کە سنوورەکان بوونی خۆیان لە دەست دەدەن، وەك چۆن دەسەڵات بە هەموو ماناکانەوە بوونی تەواو دەبێت، لێرەدا یاریکردنی نێو دەق دەشێ یاریکردنی نێو خەیاڵ بێت، لە یاریکردنی نێو خەیاڵیش هیچ مەعریفەو زانستێك جێی متمانەو پشت پێبەستن نیین، لەوێوە براوەو دۆڕاوی تیا دەرناکەوێت، ئیتر دەگەینە ئەوەی کە ئەو جۆرە یاریکردنە نە هەڵگری بیرۆکەی ئامانجی مێژوویی‌و نە واقیع، نە بڕوای بە تاك مانایی‌و تاکە ڕاستییەکدایە نە حەقیقەتێکی ڕەها.

زمانی دەقی ئەدەبی لەوێوە دەردەکەوێت کە هیچ مەعریفەو زانستێك جێی متمانەو پشت پێبەستن نیین، لەوێوە بڕوای بە بردنەوەو دۆڕان لەق دەبێت، کە تەواوی دوالیزمەکان تەجاوز دەکات، وەك چۆن لەوێوە وەك دیاردەیەك بەردەوام دەگۆڕێت‌و بەردەوام لە واقیعێکەوە بەرەو واقیعێکی دیکە هەنگاو دەنێت، کە

---

[8] .بارت پێیوایە دەق دوورە لە دەسنیشانکردن و دیاریکردن، نزیکە لە دەستلێدان و بەریەککەوتن، هەر لە بەر ئەوەش دەق بە سروشتی مەجازی دەمێنێتەوە (دەستیش لە بری ئەوەی پێناسەی دەق بنووسێتەوە، پرۆسیسەکردنی وێنە دەکات، هەروەها گوتار دەربارەی دەق بوونی نییە، هەر دەبێ دەق بێت). بڕوانە:-ئاگایی زمان زمانی ئاگایی/ هـ.س.پ. ل١٠٥/١٠٦.

زەمەن پەرست نییە، بەڵکو لە گومانەوە راست دەبێتەوە. کەواتە ئەگەرچی دەقی ئەدەبی بونیادێکی کراوەیەو قابیلی دامەزراندنی بەردەوامە، بەڵام دەمەوێ ئەوە بە بیر خوێنەر بهێنمەوە کە لە زمانی دەقدا راستی رەها شوێنی نابێتەوە، وەك چۆن تەواوی دەسەڵاتی دیکتاتۆرییانە بەتاڵدەبێتەوە، هەر لە دیکتاتۆرییەتی ماناو سەرچاوەو زەمەن‌و دەلالەتەوە تا دیکتاتۆرییەتی نووسەرو خوێنەرو کەلتوور، لەو حاڵەتەدا زمانی دەق هەڵگری تەواوی جیاوازییەکان دەبێت، بەو مانایەش چەمکی دەق لە جیاوازی خوێندنەوەکان‌و پرشنگی خەیاڵی خوێنەرەوە دێتە بەرهەم، لێرەدا ئەگەر بەشێکی چەمکی کرانەوە پەیوەندی بە جیاوازییەکانەوە بێت، بەشێکی پەیوەندی بەو هێڵە نادیارانەوەیە، کە لەوێوە زمان بە دنیامان دەبەستێتەوە. وەك چۆن ئەگەر بەشێکی تێگەیشتنمان بۆ دەق بە ئاستی رۆشنبیریی‌و پرس‌و خەیاڵەوە بەند بێت، ئەوە بەشێکی دیکەی پەیوەندی بەوە دایە کە دەق زەمەن ناپەرستێت، وەك چۆن ئامانجێکی دیاریکراویش ناپەرستێت، بەڵکو لە پرسی بەردەوامدا یارییەکانی خۆی درێژە پێدەدات، هەر بەو مانایەش پرۆسەی خوێندنەوەو رەخنە پەیوەندی بەو فەزا ئازادەدایە کە دەقی ئیبداعی لە چاوەڕوانی خوێنەر دەیخاتەوە.

## باسی دووەم

### جیاوازییەکانی خوێندنەوە

ئـەدەب چـییە؟ هەڵبەتـە ئـەو پرسـیارە دەشـێ بـەردەوام تێـڕوانین و جیهـانبینی جیـاواز بخاتـەوە، ئەگـەر (سـارتەر) ئـەو پرسـیارە لـە کەشـفکردنی دنیـاو مرۆڤـدا کورتبکاتـەوە، ئـەوە یـەکێکی وەك (مـیلان کۆنـدیرا) بـە هـەوڵی کەشـفکردنی لایەنـە پەنهانەکانی بوونی مرۆڤی دادەنێت[٩]. بەو مانایەش ئەدەب چییە دوو جیهــانبینی نیشــان دەدات، یــەکێکیان پەیوەنــدی بــە بابەتخوازییەوەیە، ئەویدیکە بەسەربەخۆیی گوتاری ئەدەبییەوە، یـەکێکیان پەیوەنـدی بـە حەقیقەتەوەیـە، ئەویدیکە بەحەقیقـەتی خـودی ئەدەبییـەوە، لـە نێـوان حەقیقـەت و حەقیقـەتی خـودی ئـەدەبی، لـە نێـوان بابـەتخوازی و خـودێتی، دنیایـەك لـە ئاڵۆزی و پرسـی جیـاوازو سـنووری جیـاوازو ڕەهەنـدی جیـاواز هەیـە، دنیایــەك لــە تێپەڕانــدن و تێنەپەڕانــدن، دنیایــەك لــە دەنــگ و دەنگدانەوە.

ئەگـەر بابـەتخوازی دەنگدانـەوەی دنیـای دەرەوە بێـت، ئـەوە خودگـەرایی دەنگدانـەوەی وسـبەلێکراوەکانی ناوەوەیـە، ئەگـەر بابــەتخوازی ئاشـکراکردنی حەقیقـەت بێـت، ئـەوە خودگـەرایی

---

٩) : تزفیتان تودوروف– نقد النقد– ترجمة:– د. سامي سويدان/مراجعة:د.ليليان سويدان بغداد ١٩٨٦،ص،٩.

گێڕانــەوەی حەقیقەتــە، لــە نێــوان ئاشــکراکردنی حەقیقــەتو گێڕانەوەی حەقیقەت، تێپەڕاندنو تێنەپەڕاندن هەیە، ئەدەب وەك ئیبداع بەردەوام کار لەسەر جوانکردنی پەیوەندی نێوان تێپەڕو ئەبەدیی دەکات، بەردەوام کار لەسەر پرسو گومان دەکات، بەڵام ئاشکراکردنی حەقیقەت، راستیو هەڵەمان نیشان دەدات. ئەگەر راستی خۆی لە ئاوێنەی واقیعدا هەڵگرێتەوە، هەڵە زێتر خۆی لە وەهمو خەیاڵدا دەبینێتەوە، ئەگەر راستی پەیوەندی بە دیدو بۆچوونێکی دیاریکراوەوە هەبێتو هەڵگری واقیعێکی تایبەت بە خۆی بێت، ئەوە هەڵە لە نادیار راست دەبێتەوە، یان وەك ئەدەب خۆی لە رەنگاو رەنگیدا هەڵدەگرێتەوە، ئەدەب رەنگاو رەنگی نمایان دەکات، ئەدەب بەشی زۆری وەهمو خەیاڵو فەنتازیایە، بەڵام نەك بەو مانایەی کە ئەدەب دوورە لە راستی، بەڵکو بەو مانایەی کە ئەدەب بڕوای بە یەك رووی راستیی نییە، نەك بەو مانایەی کە ئەدەب بڕوای بە واقیع نییە، بەڵکو بەو مانایەیە کە ئەدەب روویەکی دیکەی واقیعمان نیشان دەدات کە ئێمە لە بەرامبەری نابیناین.

ئەگەر راستی بە شێوەیەکی ئاسۆیی لەگەڵ واقیع رێبکاتو زەمەنێکی تایبەت بە خۆی بسازێنێت، ئەوە ئەدەب بە ستوونی دادەبەزێتە نێو واقیعەکانو لە هەموو زەمەنەکان بوونی خۆی دەسەپێنێت، لێرەوە کاتێك (سارتەر) دەڵێت ئەدەب کەشفکردنی مرۆڤو دنیایەو (میلان کۆندێرا) دەڵێت ئەدەب هەوڵێکە بۆ

کەشفکردنی لایەنە شاراوەکانی وجودی مرۆڤ،[10] دوو بۆچوونی جیا دەخەنەوە، یەکێکیان بەرەو دیاردە رۆشنبیرییەکان دەچێت، ئەو دیاردانەی کە ژینگەی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی دروست دەکەن و دەشێ لەوێوە دەستی لە کەشفکردنی مرۆڤ و دنیادا هەبێت، ئەویدیکە بەرەو بونیادە خودییەکانی ئەدەب شۆڕ دەبێتەوەو لەوێوە دەکرێ لایەنە وسبەلێکراوەکان و خەفەکراوەکانی وجودی مرۆڤ کەشف بکات.

لە سەر بنەمای ئەو دوو بۆچوونە دەتوانین بڵێین رەخنە سەرەڕای ناونانە جۆر بەجۆرەکانییەوە، سەرەڕای شەپۆلە مەعریفییە جیا جیاکانی، لە لایەك کار لە سەر توێکاری دەق دەکات و بە پێی میتۆدێکی دیاریکراو راڤەکانی خۆی دادەڕێژێت، لەلایەکی دیکە بە مانا نوێیەکەی لەگەڵ دەق دەکەوێتە دانوستان و بە پێی بۆچوونە جیاوازەکانی خوێنەر و ئاستە جیاکانی خوێنەر دەقێکی دیکەی لێدەکەوێتەوە، واتە لەلایەك بۆ ئاسۆکان و مێژوو و مەرجەع دەگەڕێتەوە، لە لایەکی دیکە بە دابەزینی ستوونییەوە پەیوەست بە چێژ دەبێت.

لە نێوانی ئەو دوو دیدە پرسیاری رەخنە چییە؟ رەخنە دەبێت چی بکات؟ ئەگەرچی وەك دوو پرسیاری کۆن دەکەونەوە، بەڵام لە کاتێکدا دەڵێین رەخنە زانستە، بەو مانایە دێت کە ئەدەب هەڵگری مێژووی ئەدەبە، بەو مانایە کە رەخنە مەعریفەیە و بە درێژایی مێژوو هەوڵی پۆلینکردن و ئاشکراکردن و

---

[10] – تزفیتان تۆدۆرۆف–نقد النقد– هـ.س.پ.

پرۆسیسەکردن و جێبەجێکردنی گریمانکراوە مەعریفییە دیاریکراوەکانی خۆی دەدات، کە دەڵێین رەخنە زانستە بەو مانایە دێت کە سیستەم شوێنی ئاژاوە دەگرێتەوە، بەو مانایە دێت کە لۆژیکی ئەدەبی و حەقیقەتی دەق و بەهای ئەدەبی و هونەری و شێوەو وەزیفەکان دیاری بکرێن، لە روویەکی دیکەش کە دەڵێین رەخنە زانستە راستەوخۆ پەیوەندی بە هەڵەی مەعریفی و هەڵەی میتۆدییەوەش هەیە، چونکە بەردەوام میتۆدەکان لە سەر ئیشکالییەتی میتۆدی بەر لەخۆیان دادەمەزرێن، لێرەوە بەیەکلکانی زانست و رەخنە دابڕانی مەعریفیشی لێدەکەوێتەوە، لەوێشەوە میتۆدخوازی دەبێتە کاری ئەکادیمیاو ئەکادیمییەکان، بەڵام ئیبداع بەردەوام کار لەسەر جوانکردنی پەیوەندی نێوان تێپەڕو تێنەپەڕ دەکات، ململانێی ئەکادیمیاو ئیبداعیش ململانێی تەجاوزکردن و سنووردانانە، ململانێی تێپەڕاندن و بنبەستبوونە، ململانێی گەڕانەوە بۆ مەرجەع و چێژ وەرگرتنی هەنووکەییە.

بەڵام ئەمرۆ لە بەرامبەر رەخنە بە مانا (کۆن)ەکەی[11] جۆرێکی دیکە لە دەرکەوتنی خوێنەر دەبینرێت کە سنوور بەندی

---

[11]-کە دەڵێم بە مانا کۆنەکەی دەمەوێت پەنجە بۆ ئیشکالیەتی پرۆسەی خوێندنەوە درێژ بکەم، کە خوێنەر دەکاتە دوو بەش، یەکێکیان کە ئێمە لێرەدا جەختی لێدەکەینەوە پشت بە چێژ دەبەستێت، لە بەرهەمهێنانی چێژ دەگاتە ترۆپکی خۆشی، بە خوێنەری خوێنەرانەوە ناو زەد کراوە. ئەویدیکە بە لێکدانەوەو راڤەکردن و کردەی هیرمۆنیتیکییەوە هەڵدەسێ و لە سەر بنەمای (شارەزاییە حەشاردراوەکانی بۆماوە) و (دەوروبەر) مامەڵە لەگەڵ

ناناسێت، جۆرێکی دیکە لە دیدو بۆچوون و گفتوگۆو دانوستان هەیە، کە بە میتۆدی دیاریکراوو مەعریفەی سنووردارو تاکایەتیی پیرۆزکراوەوە بەند نییە، ئەویش (بە مانا نوێیەکەی رەخنە بە -خوێندنەوە) ناسکراوە.

خوێندنەوە پرۆسەیەکی هەستپێکراوو دیارە لە رستێك گریمانەو خەون و خەیاڵ و ئومێدو نائومێدی پێکهاتووە، بەو مانایەش پرۆسەیەکی بە نێویەکداچووو ئاڵۆزە کار لە سەر بەرهەمهێنان دەکات لە حاڵەتی شیانییەوە بۆ حاڵەتی بەخشش، لە حاڵەتی شاردنەوەوە بۆ حاڵەتی پراکتیزەبوون، لە حاڵەتی هەبوون بە هۆی هێزەوە بۆ حاڵەتی هەبوون بە هۆی کردەوە.

کەواتە خوێندنەوەو رەخنە لەوێوە لە یەکتر جیادەبنەوە کە رەخنە بەردەوام کارکردن بووە لە سنوورەکانی دەق، یان بە مانایەکی دیکە ملکەچی دەسەڵاتی دەق و نووسەر بووە، بەڵام خوێندنەوە گفتوگۆکردنە لەگەڵ دەق و بەشداریکردنی خوێنەرە لە پرۆسەی ئیبداعیدا، خوێندنەوە نوێنەرایەتی دەسەڵاتی خوێنەری هوشیارو شیکارئامێزو چێژخوازی لە خۆگرتووە، لە هەمان کاتدا بە گشتی هەوڵدەدا کە لە چوونە نێو چەمکی خوێنەری گشتگیر بە مانا میتۆدگەرییەکە دوور بکەوێتەوە، هەروەك چۆن کار لە هەڵوەشانەوەی هەموو ئەو چەمك و

---

دەق دەکات، بە خوێنەری رەخنەگر ناو دەبرێت. بڕوانە:- زید الشهید/تأويل النص بين الثوابت و الدلالات المفترضة- پێگەی گوگول- ١١/٦/٢٠٠٦.

دەستەواژانە دەکات کە دەکەونە دوتوێی دەسەڵاتی دامەزرێنەرانەی دەقەوە، لە لایەکی دیکە رەخنە جۆرێك لە ئەرزش و پلە بۆ نووسەرو دەق دادەنێت، بەڵام خوێندنەوە لە سەر بنەمای چێژو بیرورا گۆرینەوەو دانوستان دروست دەبێت. رەخنە دەکەوێتە ژێر سێبەری دەق، خوێندنەوە لە نێوان داهێنەرو خوێنەری داهێنەر داواکانی یەکسانی بەرزکردۆتەوە. رەخنە کاری بنەرەتی خۆی لە نێوان بەرجەستەکردنی ماناو پەیامدا هەڵدەگرێتەوە. خوێندنەوە پرۆسیسەی چێژو ئیستێتیکا دەکات، کار لە سەر دۆزینەوەی مانا جیاوازەکانی دەق دەکات.

بە مانایەکی دیکە داهێنان ئەو کاتە دەردەکەوێت کە ئامادەگی هوشیارانەی خوێنەرو بیرکردنەوەو چێژی خوێندنەوە بوونی هەبێت، داهێنان بێ بەشداریکردنی خوێنەر بوونی لەنگە، کەواتە ئەگەر میتۆدخوازی خانە بەندکردنی ئەدەب و دیاریکردنی سنوورەکانی هونەر بێت، قسەکردن بێت لە سەر دیاریکردنی ماناو پشتگوێخستنی رووە جیاوازەکانی دیکە ماناو قسەکردن بێت لە سەر دەق لە میانی مەعریفەو سنووره دیاریکراوەکانی مەعریفە، ئەوە میتۆدگەرایی لەوێوە بنبەستبوونی خۆی رادەگەیەنێت کە ژیان بەردەوام لە کەشفکردن و چێژ بردن و گەشەکردن و پێشکەوتندایە، بەردەوام لە نوێبوونەوەدایە، دنیای دیکە دەخاتەوە، ئاوازی دیکە دەڵێت، شێوازی دیکە دادەهێنێت.

کەواتە ئیتر قسەکردن لە سەر میتۆدو میتۆدگەرای بەشێکی زۆری قسەکردنە لە سەر وەزیفە بە مانا بەرتەسکەکەیەوە، وەك

چۆن قسە کردنە لە سەر خانەبەندکردن‌و پۆلینکردن. سەیرکردنی رەخنە بە پێی میتۆدەکان لە بچوکترین پێناسەدا پێشێلکردنی مافەکانی خوێنەری لێدەکەوێتەوە، سنووردارکردنی دیدو بۆچوونە جیاوازەکان‌و قۆرغکردنی فرە رەهەندی‌و چێژو رووە جیاوازەکانی مانا دەگەیەنێت.

لێرەوە خاڵی بەریەککەوتنی دەسەڵاتی خوێنەرو دەسەڵاتی دەق داهێنانی لێ لەدایک دەبێت، خوێنەر بەردەوام بە ئاگایی‌و جیهانبینی‌و خەیاڵبینی دۆزینەوەکانی خۆیەوە بەشداری لە داهێنان‌و چێژی داهێنان دەکات، هەر لە سەر ئەو بنەمایەش دەسەڵاتی نووسەر تەنها ئەو ساتە بوونی دەبێت کە لە پرۆسەی نووسیندایە، ئەگینا کە دەق لەدایک دەبێت نووسەر بە مانا (بارت)ییەکەی دەمرێت[12]، مەرگی نووسەر ساتەوەختی بەرهەمهێنانی چێژە، مەرگی نووسەر مەرگی دەسەڵاتی نووسەرە بە سەر دەسەڵاتی خوێنەردا، ئەو دەسەڵاتەی کە رەخنە سەردەمێك لە سەردەمەکان کاری لەپێناو بە پیرۆزراگرتنی دەکرد، هەروەها دەسەڵاتی دەقیش لەئامادەگی خوێنەری داهێنەرو بە ئاگاو وشیارەوەیە، لەو ساتەی کە دەق توانای گفتوگۆو دانوستانی پێیە، لە دەقی کراوەدایە، ئەو دەقەی کە هەڵگری جیاوازییە بە هەموو ماناکانییەوە.

---

12. بڕانە: رۆلان بارت/ مەرگی نووسەر– گۆڤاری سەراب/ژ☹٣-٤)، و: ئازاد بەرزنجی.

دواجار دەمەوێت بڵێم ئیبداع و پەرگیریی هەرگیز بەیەکەوە هەڵناکەن، چێژگەرایی و میتۆدگەرایی هەمیشە لە ئیشکالدان. داهێنان هەمیشە لە جیاوازییەکانەوە خۆی بونیاد دەنێت، لە بڕوابوونی بە جیاوازییەوە فەزا رەنگاو رەنگەکانی خۆی دەکاتەوە، بێ بڕوابوون بە جیاوازی و فرە رەهەندی و چێژو کرانەوە.... داهێنان کورتی دێنێت، بێ بڕوابوون بە خوێنەری جیاوازو خەیاڵبینی و چێژو دیدی جیاوان، ئیبداع لەنگە.

لێرەوە دەشێ دووبارە ئاماژە بە جیاوازییەکانی رەخنەو خوێندنەوە بکەین، بەو مانایەی کە رەخنە بە پێی سیستەم و مەعریفەیەکی دیاریکراو کار دەکات، بەڵام خوێندنەوە هاوبەشیکردنی خوێنەرە لە کاری داهێناندا، بەو مانایەش خوێندنەوە داهێنانی دەقێکی دیکەیەو پشت بە خوێنەری داهێنەر دەبەستێت، چونکە وەك (ئەدۆنیس) دەڵێت: فیکری ئیبداعی کە بە نێو جەهلدا گوزەر دەکات، بە قەد جەهل بچووکدەبێتەوە.[١٣]

یەکێك لە گرفتەکانی ئیبداعی کوردی ئەوەیە کە بە نێو جەهلدا تێدەپەڕێت، ئەو قسەیەش لەوێوە دێت کە هەرگیز لە نێو رۆشنبیریی کوردی داهێنان وەك هەبوویەکی سەربەخۆ سەیر نەکراوە، بەڵکو بەردەوام وەك پاشکۆ تەماشا دەکرێت، بە بڕوای من تەماشاکردنی داهێنان وەك پاشکۆ لەوێوە دێت کە بڕوابوون

---

[13] .بڕوانە: ئەدۆنیس ، کفتوگۆ لەگەڵ ئەدۆنیس–و:نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد/دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠.

به جیاوازی هیچ بنەمایەکی رۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی و سیاسی لەبەر دەستدا نەبێت، لەوێوە کە بڕوابوون بە تەجاوزکردنی بونیادی باو جۆرێکە لە خیانەت.

کاتێک وەک تاک بیروڕایەکی جیاوازت هەیە، ئیتر تۆ بە هەڵگەڕاوە دەژمێردرێت، ئەوەش راستەوخۆ بە بونیادی کۆنی ئایینەوە بەندە، وەک چۆن ئەوە بونیادی کۆنی ئایینییە لە بونیادی سیاسی ئەمڕۆماندا رەنگدانەوەی دەبینرێت، بە دیووەکەی دیکەش ئەوە بونیادی سیاسیمانە لە نێو ئەدەب و هونەردا رەنگدەداتەوە، کەواتە کاتێک ئیبداع وەک پاشکۆ سەیر دەکرێت، لە بەرامبەر ئەوە بیروڕاو بۆچوونی جیاواز وەک کرێگرتەو خایین لە قەڵەم دەدرێت، ئەوەش هەمان دووالیزمییەتی ئیماندارو بێئیمانمان بیر دەخاتەوە.

*****

پەیوەندی رەخنە لەگەڵ رەخنەدا دەکەوێتە دوتوێی پەیوەندی خوێنەر لەگەڵ دەقدا، بەو مانایەش ئەگەرچی خوێندنەوە پێویستە کاری بەرجەستەکردنی چێژو ئیستێتیکا بێت و خۆی لە حوکمدان بەدوور بگرێت، بەڵام بە دیووەکەی دیکەش لە خولیا فیکری و مەعریفی و رۆشنبیرییەکانی دیکە بەدەر نییە.

مەعریفە ئاراستەی بابەت دەکرێت، کەچی حوکم لە رەخنە بە ناوە جیاوازەکانییەوە جگە لە رەخنەی بونیادگەری بەزۆری ئاراستەی ئەو کەسە دەکرێت کە بە کاری بابەتەکە هەڵساوە، بەڵام پەیوەندی دەق و خوێنەر وەک گوتمان لە سەر دانوستان دەوەستێت، پەیوەندییەکی ئیبداعییەو دەقێکی دیکەی ئیبداعی

لێدەکەوێتـــەوە، بـەو مانایــەی کــە دەقــی ئیبــداعی بــە ویســتی ئازادانــەوە بەنــدە، کەواتــە لــەدایکبوونی ئــەو دەقــە بــە دەوری بابەت و حوکمدان ناخولێتەوە، بەڵکو لەسەر گفتوگۆو لێکخشانی فیکریــی و مـــەعریفی خوێنـــەرو دەق دەوەســـتێت، لەوێشـــەوە پڕشنگەکانی چێژو ئیستێتیکا درێژە بە یارییە کراوەکان دەدەن، دووبارە لە چاوەڕوانییەکی دیکەدا خۆیان هەڵدەخەن.

دووبـــارە دەمـــەوێت بڵـــێم پەیوەنـــدی خوێنـــەرو دەق پەیوەندییەکی کراوەیەو لە سەر دۆزینەوە وەستاوە نەك حوکم، بە ئیستێتیکاو چێژەوە بەندە نەك بابەت، بەو مانایەش زمانی ئــەدەبی لــە ســەر درەوشــانەوەی نــاوەوەی خــۆی رادەبێتــەوە، زمانێکــە بــەردەوام لــە نکــۆڵیکردنی مانــاوە درێــژە بــە ژیــانی ئیســـتێتیکیانەی خـــۆی دەدات، چـــونکە خـــۆی وەك ئـــامرازی گواستنەوە ناخاتە روو، بەڵکو بەردەوام لە درەشانەوەی خۆیدا پڕشــنگ دەداتــەوە، لێــرەوە ئــەدەب لۆژیکــەکان تێکدەشــکێنێت و لۆژیکی تایبەت بەخۆی دادەهێنێت، لۆژیکی ئەدەبی پەیوەندی راســتەوخۆی بــە وەهــم خەیاڵەوەیــە، کەواتــە زمــانی ئــەدەبی دەکەوێتـــە ئـــەو دیـــو عەقڵـــەوە، دالێکـــی رووتـــە، لـــەو پـــەڕی درەوشانەوە وشەکانی بوونی خۆیان لە دەستدەدەن و شیعرییەت دەخەنــەوە، شــیعرییەتیش چــێژ دەرێــژێت و چــێژیش پەیوەنــدی تێپــەڕو تێنەپــەڕ بــە جاویــدانی دەســپێرێت، هــەر لێرەشــەوە دەتــوانینین ئامــاژە بــەوە بــدەین وەك چــۆن حەقیقــەتی گشــتگیر بــوونی نییــە، بــە هــەمان شــێوە بڵــێین خوێندنــەوەی گشــتگیریش دەکەوێتە دەرەوەی پرۆسەی داهێنانەوە، لە سەر ئەو بنەمایەش

دەشێ خوێنەری گشتگیر بە میتۆدەکانی رەخنەوە پەیوەست بکەین، ئەو پەیوەستکردنەش لەوێوە دێت کە میتۆد وەك گوتمان هەڵگری مەعریفەیەکی دیاریکراوە، هەر لەوێشەوە دەکرێت بە ئایدیۆلۆژیاوە بەندی بکەین.

هەولێر ٥/٤/٢٠٠٦

نووسین کلیله بۆ ناسینی جیهان، نەك جیهان کلیل بێت بۆ ناسینی نووسین.

(بارت)

زمان ترسناکترین نیعمەتە.

( هیلدرین )

# بەشی دووەم

# باسی یەکەم

## زمانی ڕەمزئامێزو زمانی هەڵچوونئامێز

هەموو وشەیەك کە دەدوێ هەڵگری دەنگ‌و دەلالەتە بە پێی ناوکۆیی‌و دەربڕینی ئازادانەوە نەخش‌و ئیقاع‌و چڕییەکەی دەگۆڕێت، یان بە دیوێکی دیکە نەخش‌و چڕییەکەی بە پێی چیگوتن‌و جوانگوتن لە توێی جەستەی دەقدا دەردەکەوێت، خودی ئەو بەرجەستەکردنەش لەسەر کۆمەڵێك ئاستی جیا جیا دەوەستێت بۆ نموونە دەشێ مەسەلە سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری‌و سایکۆلۆژییەکان ..هتد، یان ئاستی زمان‌و ئیقاع‌و جوانکاری‌و چێژو مەعریفەو خەیاڵ، ڕۆڵی تایبەتی خۆیان بگێڕن.

خوێنەری بە توانا دەتوانێت موفارەقەکانی دەنگ‌و نووسین بگرێت‌و پێکهاتەکانی بخاتە بەر خوێندنەوە. ئەوەش دەکەوێتە سەر بەدواداچوونی ئاستەکانی زمانی چیگوتن‌و جوانگوتن، یان بە مانایەکی دیکە وەك لەم نووسینەدا کاری لە سەر دەکەین دەکەوێتە سەر کەشفکردنی دوو جۆر لە زمان، جۆری یەکەم ((زمانی ڕەمزئامێزە)) جۆری دووەم ((زمانی هەڵچوونئامێزە)) ئەو دوو جۆرە لە زمانمان لە ڕەخنەگری ئینگلیزی (ڕتشاردز) وەرگرتووە، لای (ڕتشاردز) مەبەست لە زمانی ڕەمزئامێز ئەو زمانەیە کە بۆ گەیشتن بەکار دێت، واتە زمانێکی ئامارەییەو تاکە وەزیفەی ئامانجی گەیاندنی خودی گەیاندنە. بەدیووەکەی دیکە

زمانێکە نزیکە لە لۆژیکی عەقڵ و قابیلی قبوڵکردنە ئەگەر دروست بکەوێتەوە، وەك چۆن قابیلی نکۆڵیکردنیشە کاتێك نادروست خۆی نیشان دەدات[14].

بەلاّم زمانی هەڵچوونئامێز ئەو زمانەیە، کە ئامانجی لە گەیاندنی زانیارییەکان کورت ناکرێتەوە، بەڵکو زمانێکی بارگاوی و جولەئامێزەو دەمانخاتە نێو فەزای گومان و خەیاڵکردنەوە، هەرگیز خوێنەر لە رێگەی راستی و ناراستییەوە پێی ناگات، بەڵکو زمانێکە بلاّو دەبێتەوە خەیاڵ و بیرکردنەوە کێش دەکات، هەستەکان دەدوێنێت. بۆیە شیعرێك کە لە سەر ئەو زمانە هەڵچنرابێت، هەستی خوێنەر بەرەو سەرگەرمی و نەشوە دەبات[15].

---

[14] –بەلاّم پۆل ریکۆر دوو شێواز بۆ مامەلەکردن لەگەڵ رەمز جیا دەکاتەوە، یەکەم مامەلەکردنە لەگەڵ رەمز وەك پەنجەرەیەك بۆ روانینە سەر جیهانێك لە مانا، لەم بارەدا رەمز ناوەندێکی تەنکەو ئاماژە بۆ ئەودیوو خۆی دەکات، شێوازی دووەم، وەك راستییەکی ساختەو نادروست مامەڵە لەگەڵ رەمزدا دەکات، پێیوایە ناکرێت برِوا بە رەمز بکرێت، بەڵکو پێویستە لابدرێت بۆ گەیشتن بە مانای شاراوەی پشت راستیە ساختەکان، لەم بارەدا رەمز مانا ئاشکرا ناکات، بەڵکو دەیشارێتەوەو لە جیاتی ئەو مانایەکی ساختە دەخاتە روو، لێرەدا ئەرکی راڤەکردن لابردنی مانای ساختەو رووکەشە بۆ گەیشتن بە مانای راستەقینەو ناوەکی. بۆ زێتر شارەزابوون برِوانە: نصر حامد ابو زيد– اشكالية القراءة و التاويل– المركز الثقافي العربي– ط٤– ١٩٩٦/ الفصل الاول، ص٤٤.

[15] – برِوانە: رامي ابو شهاب/اللغة الحافز و المؤثر، مجلة الجسور–٢٠٠٤. .www.arabicstory.net/

لە سەر ئەو بنەمایەی (رتشاردن) دەتوانین بڵێین زمانی ڕەمزئامێز لە سادەترین پێناسەیدا شتێکمان بیر دەخاتەوە کە ئامادەیی لە ئێستادا نییەو شتێك لە بری ئەو دادەنێین کە ئەویش ئاماژەیە، ئاماژە هەمیشە بەرەو ماناو دەلالەتە کەڵەکە کراوەکانمان دەکاتەوە، یان بە مانایەکی دیکە بەرەو یادەوەریو مێژووی کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریو سیاسی کێشمان دەکاتو بە شێوەیەکی گشتی شێوەی گێڕانەوەی لەخۆدا هەڵگرتووەو هەر لەوێشەوە گەشە مێژووییەکانی خۆی وەك ئەزموون دەخاتە روو، لەسەر ئەو بنەمایە جۆرێك لە سنووداری دەنەخشێنێت، بە مانایەکی دیکە هەموو ئەزموونێك سنووری دیاریکراوی خۆی هەیە.

ئەویدیکەیان زمانی هەڵچوونئامێز، دەشێ بە جۆرێك لە جۆرەکان بە زمانی ساتەوەختی نووسین، یان بە زمانی ڕووداو، جولە، یان بە مانایەکی دیکە لە عەفەوییەتی نووسینو ئازادی خەیاڵ هەڵیگرینەوە، واتە وەك چۆن سەرەتای دیار نییەو پەیوەندی بە حاڵەتی نووسینو ئازادییەکانی خەیاڵو بیرکردنەوەی تاکەوە هەیە، بە هەمان شێوە کۆتایشی نادیارەو بەرەو جۆرێك لە شیعرییەتمان دەکاتەوە، کە دەڵێم کۆتایی نادیارە بەو مانایەیە کە ئەوەی بەرهەمی دەهێنێت لەگەڵ باو نامۆ دەکەوێتەوە، ئەو رستەیە پشت بە پێناسەی داهێنان وەك وشەو وەك چەمك دەبەستێت: وەك وشە، داهێنان بە مانای خەڵق کردن دێت، وەك چەمك واتە بەرهەمهێنانی شتێکی نوێ کە

پێشتر بەم شێوەیە لە ئارادا نەبووە، ئەگەرچی رەگەزەکانیشی پێشتر هەبووبن..[16]

بەلأم (هایدگەر) دەڵێت:- کاری هونەری خۆی رووداوە، یان جولەیەکە دەشێ هەموو ئەو شتانەی کە دەکرێ بکەونە پێشییەوە پەرت و بلأویان بکاتەوە. ئینجا دەڵێت:- بوونی بەرهەم یان فۆرمەلە بوونی بەرهەم جولەیەکە کە پێشتر نەکرابۆوە، ئەو جولەیە بە شێوازێك دێتە دی وای لێدەکات نەگۆڕ بێت[17].

دەمەوێت بە شێوەیەکی دیکە بڵێم، زمانی رەمزئامێز ئەو زمانەیە، کە لە شتەکانەوە بەرەو وشەکان دەگەڕێتەوە، واتە زمانێکی گواستراوەیە، هەڵگری مێژوو و عەقلأنیەتێکی بۆماوەیە، لە واقیع و لۆژیك نزیکە.

---

[16]-کاتێك دەڵێین ئەگەرچی رەگەزەکانیشی پێشتر هەبووبن واتە دەکەوینە جۆرێك لە ئاڵۆزی، چونکە ئەگەر داهێنان لە لایەك بە تاك و ئازاییەکانی تاکی رۆشنبیرەوە پەیوەست بکەین، لە لایەکی دیکە سوود وەرگرتنە لە کایە و سەرچاوەکانی دیکە. ئەو پێناسەیە بەرەو دوو جۆر لە بیرکردنەوەمان دەبات یەکەمیان نەستی (فرۆیدی)یە، ئەودیکەیان نەستی (کۆ) یە لای (یۆنگ). فرۆید نەستی تاك لە رێگەی پرۆسەی بالأکردنەوە بە داهێنان لە قەڵەم دەدات، بەلأم یۆنگ نەستی تاك و نەستی پێشینان بە سەرچاوەی داهێنان دەژمێرێت. بڕوانە: عبدالحكيم محمود السيد، الابداع و الشخصيه، دار المعارف/القاهره،١٩٧١ ص٢١.

[17]- بڕوانە: نصر حامد ابو زيد- اشكالية القراءة و التاويل- المركز الثقافي العربي- ط٤-١٩٩٦/ الفصل الاول، ص٣٣.

بەلاّم زمانی هەڵچوونئامێز لە وشەکانەوە شتەکان رەنگ دەکاتو ئامانجی گەیاندنی زانیارییەکان نییە، بەڵکو زمانێکە لە پەیوەندییەکی شیمانەیدا وزەکانی خۆی لە رێگەی خەڵق کردنو دووبارە خەڵق کردندا دەخاتە روو، بارگاوییە بە لایەنە نەستیو نادیارەکانەوە، بۆیە لۆژیکو عەقڵ لە بەدواداچوونیدا هەمیشە کورتی دێنن، چونکە فەزایەکە سنوورەکانی دیار نیینو بەدیووەکەی دیکەش بەردەوام لەگەڵ هەستەکان خۆلێکخشاندنو جۆرێك لە نەشوەو چێژو دەمەتەقێی ئازادانەو بەبیر هێنانەوەی ئازادانە دروست دەکات، هەر لەوێشەوە دەتوانین بڵێین زمانێکە لە گەیشتن نەشوە بە جەستەی خوێنەر دەبەخشێت، ئەو چێژو نەشوەیە لە سەرسامبوونو بەریەککەوتنی دوو بیرکردنەوەو دوو هەستکردنو دوو تێڕوانینی جیاوازەوە دێتە بەرهەم، یەکەمیان هەستو بیرکردنەوەو تێڕوانینی باوە ئەویدیکەیان ناباوە، بە مانایەکی دیکە زمانی هەڵچوونئامێز بەردەوام خۆی لە پەیوەندییەکی دیالێکتیکی نێوان دیارو نادیار هەڵدەگرێتەوە، لە ئاستی ئامادەگی تاكو ونبوونی کۆ، یان لە نێوان داهێنانی تاكو یادەوەری شیعریدا بەرجەستە دەبێت.

ئەگەر بتوانین بونیادی زمانی رەمزئامێز بە عەقڵو لۆژیك پەیوەست بکەین، ئەوە بونیادی زمانی هەڵچوونئامێز لە سەر ((گرژی))و ((خاوی)) حاڵەتە نادیارەکانی نووسینو هەڵچوونی دەروونییەوە رادەبێتەوە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەمەوێت بڵێم (ئەی رەقیب) لە رووی دارشتنی زمانەوە لە سەر هەر دوو زمانی (رەمزئامێن)و

(هەڵچوونئامێز) کاری کردووە. واتە وەك زەمەن لە ڕێگەی شتەکانەوە بەرەو وشەکانمان دەکاتەوە، لە ڕێگەی زمانی ڕەمزییەوە (کوردی) لە نێو مێژوو ڕەنگ دەکاتو بە شێوەیەکی لۆژیکی وێنەکان دەکێشێتو مانەوەی کوردی بە ڕەمزو لۆژیکی هۆکارئامێزەوە پەیوەست دەکات. بۆ ئەوەش دەشێ نموونەی ڕەمزی (میدیاو کەیخوسرەو) بە هۆیەکی لۆژیکی دەرکەوتەی کوردی، لەوێشەوە وەك رووخساری هەبوونی کوردیو ڕەمزی بوونی کوردیو مانەوەی کوردی سەیر بکەین، ئەو سەیر کردنەش بە پێی تێگەیشتنو شارەزایی خوێنەر مەبەستەکان دەپێکێت. هەر وەك چۆن بە دیووەکەی دیکەش بەردەوامبوونی لەو بەیەکەوە گونجانو خەسڵەتە هاوبەشانەوە هەڵدەگرینەوە، کە خەباتو تێکۆشانی کوردییان بەرجەستە کردووە.

بەڵام زمانی هەڵچوونئامێز لە سروودی (ئەی ڕەقیب)دا لە بەرجەستەکردنی ژانوژوارە کۆمەڵایەتیو سیاسیو رۆشنبیرییەکانی منی (کوردی)و پەرچەکردارو دژبوونەوەکانی ئەویدیکە خۆی نابینێتەوە، بەڵکو بە جۆرێك لە جۆرەکان لە بەرجەستەکردنی نادیارانەی خودی (دڵدار) وەك تاك، کە خۆی تەماهی ((کۆ)) کردووە، دەردەکەوێت. لێرەدا دەمەوێت بڵێم ونبوونی منی (دڵدار) لە جەستەی (ئەی ڕەقیب) بوونی خۆی لە نادیاریو نەبوونییەوە هەڵدەگرێتەوە، یان لە بۆشایی ئەو ماوە ونبووەدا هەڵدەگرێتەوە، کە دەکەوێتە نێوان نەستی چەپێنراوی (دڵدار)و سپێتی لاپەڕە. ئەوەش لەو بڕوایەوە دێت، کە بوونی (دڵدار) وەك تاکێکی داهێنەر بە دیووە دیارەکەی پەیوەندی بە

زمانی ڕەمزئامێزەوە توونـدە، مەبەستمە بڵێم (دڵدار) وەك ڕووە دیارەکەی ئامادەگی لە تەرجەمەکردنی مێژووو خەباتی کوردا هەیە، هەر لە ڕێگەی ئەو تەرجەمەکردنەشەوە وەهمێکی ئایدیۆلۆژیمان بۆ دەنەخشێنێت. بەڵام لە بیرمان نەچێ بە دیووەکەی دیکە لە ((خاوبوونەوەی)) زمانی هەڵچوونئامێزەوە بە شێوەیەکی زۆر جوان وزە تایبەتە شاراوەو نادیارەکەی دەردەکەوێت، دەرکەوتنی ئەو وزەیە لە لایەك پەیوەندی بەو (ماوەیە) هەیە، کە دەکەوێتە نێوان ((خاوبوونەوە))ی زمان‌و (دەرنەکەوتن)ی دەسەڵاتی دڵدار.

لە لایەکی دیکە ئەگەر شێوەی داڕشتنی (ئەی ڕەقیب) وەك گوتمان لە ڕێگەی تەرجەمەکردنی ناوبراوەوە سەر بە وەهمی بەرهەمهێنانی ئایدیۆلۆژیای کوردایەتی بێت، ئەوە دەشێ خودی ئەو کوردایەتییە بە دیووە نادیارەکەی بێتە کۆدێك بۆ وزە تایبەت‌و شاراوەکانی ناوەوەی (دڵدار) لە سەر بنەمای ئەو گریمانەشەوە دەمەوێت بڵێم ((خاوبوونەوە))ی زمان ئەگەرچی پانتاییەکی لەبارە بۆ دەرکەوتن، بەڵام (دڵدار) لە بری ئەوەی هەوڵی دەرکەوتن بدات، کار لە سەر ((وەستان))ی شیعریی دەکات، واتە کار لە سەر وەستانێك دەکات، کە دەکەوێتە نێوان وشەو وشە، دڵدارو زمان، من‌و مێژوو.

## باسی دووەم

### تیۆری پێشوازی، تیۆری وەرگر

خوێندنەوەی سروودی (ئەی رەقیب) لە رێگەی هەردوو زمانی رەمزئامێزو هەڵچوونئامێزەوە وەك بنەرەتێك لە میانی رێبازە نوێیەکانی رەخنەو بە هەر دوو رێبازی بونیادگەری و سیمیۆتیکادا گوزەری پێدەکەین و دواجار لە رێبازی ((پێشوازیکردن))و ((وەرگرتن)) درێژە بە خوێندنەوەی دەدەین.

هەڵبەتە ئەو دوو زاراوەیە لە یەك چەمکدا کورت ناکرێنەوە، وەك چۆن ناکەونە تاکە ژینگەیەکەوە. چەمکی ((پێشوازی)) لە رووی تیۆریزەکردنەوە سەر بە رەخنەی (ئەنگلۆ- ئەمریکی)ییەو کۆمەڵێك رەخنەگری گەورەی لە پشتە، لەوانە (جۆناسان کولەر، نۆرمان هۆلاند، دیڤید بلیچ، مایکل ریڤاتێر..)، هەروەك تیۆری ((وەرگر)) لە ئەڵمانیا هاتۆتە بەرهەمو لە پێدراوەکانی (phenomenological-دیاردەگەرایی)و (hermeneutics-تەئویل)ەوە هەڵقوڵاوە، هەر یەك لە (ئایزەر، یاوس، فیش..) نوێنەرایەتی ئەو تیۆرە دەکەن[18].

---

[18]-پێدراوەکانی تیۆری (پێشوازی) بە شێوەیەکی دیار بەمجۆرە رەوتە مەعریفی و رەخنەیی و میتۆدییەکەی پرۆسیسە دەکرێت(جۆناسان کولەر-کار لە سەر توانای ئەدەبی دەکات. نۆرمان هۆلاند-ناسنامەی دەق. دیڤید بلیش-کاریگەری دەروونی لە تیۆری پێشوازیدا. مایکل ریڤاتێر- رۆڵی ئاماژەکان لە تیۆری پێشوازیدا).

فینۆمینۆلۆژیا خۆی بە ماهیەتی یان بە مانای دیاری وجودی مرۆییەوە خەریك دەکات، هایدگەر زاراوەی ((فینۆمینۆلۆژیا)) دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر بنچینەی یۆنانیی و دەڵێت: زاراوەکە لە دوو بەش پێکدێت-(phenomenon) لەگەڵ (logos) بەشی یەکەم ئاماژە بە کۆی ئەو شتانە دەکات کە لەبەر ڕۆژدا دەردەکەون یان لە بەر ڕۆشنای دەردەکەون، ئەو دەرکەوتن و دیار بوونەی (شت) نابێ لە سەر ئەو بنەمایە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، کە مەسەلەیەکی لاوەکییەو لەو دیوی خۆیەوە ئاماژە بۆ شتێکی تر دەکات، ئەوە مەسەلەیەکی بەسەرچوو نییە، بەڵکو دەرکەوتنی شتەکەیە وەك خۆی، بە واتایەکی دیکە: بوونی شتێك (یان دەرکەوتنی لە دەرککردندا) مەسەلەیەکی لاوەکی دوور لە خودی شتەکە نییە، بەڵکو ماهیەتی ڕاستەقینەیەتی.

(هایدگەر) دەگاتە ئەوەی میتۆدی دیاردەگەریی ((فینۆمینۆلۆژی)) لە سەر ئەو بنەمایە کار دەکات، کە شتەکان فەرامۆش بکرێن، تا خۆیان چۆنن ئاوەها دەرکەون و دیار بن، بێ ئەوەی گوتەکانمان بە سەریاندا بسەپێنین، ئەوە ئێمە نین، ئاماژە بۆ شتەکان دەکەین و دەرکیان پێدەکەین، بەڵکو خودی شتەکانن خۆیان بۆ ئێمە ئاشکرا دەکەن، بنەچەی ڕاستەقینەی تێگەیشتنی

---

بەڵام تیۆری (وەرگر) بەمشێوەیەیە (ولفگانگ ئایزەر، کار لە سەر دەقێتی و پرۆسەی وەرگر دەکات. هانز ڕۆبەرت یاوس-جوانکاری وەرگر، بەڵام ستانلی فیش، کار لە سەر شێوازگەرێتی و بەیەکگەیشتن لە کردەی وەرگردا). بڕوانە: د. محمد سالم سعداللة/ مناهج ما بعد النصية:معرفة نحو الاخر- لە پێگەی www.odabasham.net وەرگیراوە.

دروست ئەوەیە ئێمە تەسلیمی هێزی شتەکان بین، تا خۆیان بۆ ئێمە ئاشکرا بکەن، بەڵام شتەکان چۆن خۆیان ئاشکرا دەکەن؟

(هایدگەر) لە شیکردنەوەی بەشی دووەمی زاراوەکە پێیوایە (logos) دەلالەت لە فیکر ناکات، بەڵکو دەلالەت لە ئاخاوتن و ئەو ئەرکەی ئاخاوتن دەکات، کە وا دەکات فیکر مومکین بێت، شتەکان لە میانی زمانی ئاخاوتن (speakinig) خۆیان ئاشکرا دەکەن، لێرەدا زمان کەرەستەیەك نییە بۆ گەیاندن، کە مرۆڤ بۆ بەخشینی مانا بە جیهان، دایهێنابێت. یان گوزارشت لە تێگەیشتنی زاتیانەی خۆی بۆ شتەکان بکات، بەڵکو زمان گوزارشت لەو (ماناگەرییە) دەکات، کە بە کردەوە دەکەوێتە نێو شتەکانەوە، مرۆڤ زمان بەکار ناهێنێت، بەڵکو ئەوە زمانە لە میانی مرۆڤەوە قسە دەکات. جیهان لە میانی زمانەوە خۆی بۆ مرۆڤ دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی زمان بواری تێگەیشتن و تەفسیرە، کەواتە جیهان لە میانی پرۆسەگەلی بەردەوامی تێگەیشتن و تەفسیرەوە خۆی بۆ مرۆڤ ئاشکرا دەکات، ئەوە مانای ئەوە نییە، مرۆڤ لە زمان دەگات، بەڵکو مرۆڤ لە میانی زمانەوە تێدەگات. زمان ناوەندکاری نێوان جیهان و مرۆڤ نییە، زمان دەرکەوتن و ئاشکرابوونی جیهانە پاش شاردنەوەی. زمان دەرکەوتنێکی وجودییانەی جیهانە.[١٩]

---

[19]– بڕوانە: ا نصر حامد ابو زيد– شكالية القراءة و التأويل– المركز الثقافي العربي– ط٤–١٩٩٦/ الفصل الاول، ص٣٢،٣١.

کەواتە شتێکی ئاساییە لە ژێر رۆشنایی ئەم روانینە، کاری ئەدەبی و هونەری لە داهێنەرەکەی جیا بێتەوەو لە خۆیدا بێتە دەرکەوتنێکی وجودییانە، لێرەوە تێگەیشتن لە کاری هونەریو ئەدەبی دەبێتە ئەرکێکی وجودیی وەها کە بوونی مرۆیی لە جیهانداو تێگەیشتنی مرۆڤ لەو بوونە دەوڵەمەندتر دەکات.

بەمجۆرە دیاردەگەرایی لای (هایدگەر) دەبێتە هیرمنیۆتیکاو هیرمینۆتیکاش دەبێتە پرۆسەیەکی وجودییانەی تێگەیشتن، تێگەیشتن بریتییە لە توانای دەرککردنی شیمانە وجودییەکانی تاکە کەس لە رەوتی ژیانو بوونی لە نێو جیهان، بەو واتایە ماناکان بە پێی گەشەسەندنی مێژوویی لە گەشەسەندن دان.

بەلأم (گادامێر)و هیرمینۆتیکای (گادامێر) بە هیرمینۆتیکای فەلسەفی ناودەبرێت لەوێشەوە درێژ دەبێتەوە تا هەموو ئەو ((تەفسیرکردن))و ((تێگەیشتن))و ((جێبەجێکردن))انە بگرێتەوە کە هۆی پەرەسەندنی درککردنن.

ئەگەرچی هیرمینۆتیکای (گادامێر)ی ناچێتە خانەی دووبارەکردنەوەی هایدگەرییانەوە، بەلأم دەشێ بە درێژکردنەوەو بەرفرەوانکردن ئەوی دابنێن، بۆیە دەبینین ئەو دوو خەسڵەتەی لە هیرمینۆتیکای (هایدگەر) لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەق بەرچاو دەکەوێت، لە (گادامێر)یش رەنگدانەوەیان هەیە، خەسڵەتی یەکەم:- دەق کەشفی وجود دەکات، حەقیقەت یان مانایەك لەخۆ دەگرێت، کە تەجاوزی چواچێوەکانی بونیادو فۆرم دەکات. خەسڵەتی دووەم:- تەفسیرکردنی دەق (دواجار

حـــاڵیبوونی) دەبێـــت بـــە یەکـــەوە تـــەجاوزی چواچـــێوەی بابەتگەرایی و خودگەرایی بکات.[20]

ئەو دوو خەسڵەتە دوو خەسڵەتی خودی زمانیشن ئەوەش مانای ئەوەیە، کە ڕێگەی تێگەیشتن لە دەق، لە فەرزکردنی تێگەیشتنی ماهیەتی خودی زمانەوە بەرجەستە دەبێت، وەك چۆن ماهیەتی زمان لای (هایدگەر) لە کەشفکردن یان دەرخستنی وجودەوە دێتە ئاراوە، بەو مانایە زمان لای (هایدگەر) دەبێتە ماڵی بوون، کەواتە بۆ ئەوەی بگەینە هەبووەکانی دەبێت بەو ماڵەدا گوزەر بکەین.

بە هەمان شێوەش (گادامێر) پێیوایە بۆ تێگەیشتن و تەفسیرکردنی دەقی ئەدەبی دەبێت پشت بە تێگەیشتنی ماهیەتی خودی زمان ببەستین، نەك هەر وەك دەقێکی نووسراو، بەڵکو وەك دەقێکی گوتراویش، هەروەها هیرمینۆتیکای زمان لای (گادامێر) گەڕانە بە دوای مانادا، (گادامێر) دوو شێوە لێدان، یان گوتن جیا دەکاتەوە یەکەم: ئەو گوتنەی هیچ ناڵێت، ئەگەرچی ئامادەیی خۆی لە گوتنەوە هەڵدەگرێتەوە. دووەم: ئەو گوتنەی بە هۆی گوتنەوە بە پێی نیازی پرۆسەکە پەردەپۆش دەکرێت.[21]

---

[20]--سعيد توفيق،( هرمينوتيكا الادبي بين هيدجر و جادامير) مجلة (النزوى) العدد (٢)تصدر عن موسسة (عمان) للصحافة و الانباء و النشر و الاعلان لا٨٥.

[21]– سەعید تۆفیق،( هـ.س.پ) ل٨٧

کەواتە ماهیەتی زمان لای (گادامێر) بە هۆی بەکارهێنانی ئامێرکارییانەی ستراتیژی زمانەوە دادەپۆشرێت، بەو مانایەش یان ئەوەتا زمان خاڵی دەبێت لە هەموو مانایەکی کەشف کراو، یان زمانی گوتراو ئەو مانایەی کە دەیەوێت بیخاتە روو، دایدەپۆشێت. بەمجۆرە زمان لای (گادامێر) خۆی لە کەشفکردندا هەڵدەگرێتەوە، بەڵام ئەو مانایەی کە کەشف دەکرێت، مانایەکی لۆژیکی نییە، بەڵکو شێوازێکە بۆ تێگەیشتنی دنیا و شتەکان، بە دیوەکەی دیکەش بەکارهێنانی ئامێرکارییانەی زمان ماهیەتی زمان پشتگوێ دەخات.

لێرەدا دەتوانین بڵێین هیرمینۆتیکا واتە کرانەوە بە رووی ئەویدیکە (یان دەق)، بەڵام نابێت ئەویدیکە لە نێو وێناکردن یان چەمکی ئایدیۆلۆژیدا قەتیس بکەین، چونکە هیرمینۆتیکا وەك ئەوەی تەفسیر دەکرێت لە سەر گفتوگۆی جیاواز رادەبێتەوە، تەفسیرکردنێکە کە تەجاوزی دوالیزمیەتی (خود/بابەت) دەکات، بە مانایەکی دیکە هیچ لایەنێك بە سەر ئەویدیکە زاڵ ناکات.

بەمجۆرە لای (گادامێر) پرۆسەی خوێندنەوە جۆرێکە لە پرد دروست کردن لە نێوان ئەو ((بۆشایی))ەی کە دەکەوێتە نێوان رابردووو ئێستا.[٢٢] لەو تێگەیشتنەش جۆرێك لە ئاوێتە بوون لە نێوان "ئاسۆی پێشبینیەکانمان" و ئاسۆکانی نووسینی

---

[22] - بۆ زێتر شارەزابوون بڕوانە: فخري صالح (ناقد و مترجم من الاردن) من توقعات القاريء تالى معنى التجربة الجمالية- مجلة نزوى/العدد ١٩/شهر يوليو/١٩٩٩/ص٢٣٩-.

رابردووو خوێندنەوەكان بە دەست دێت، ئەو ئاوێتە بوونەش لە لۆژیكی پرسیارو وەڵامەوە بەرجەستە دەبێت، بەو مانایەی كە دەق هەڵگری پرسی خۆیەتی و خوێنەریش وەڵامی تایبەت بەخۆی هەڵگرتووە.

ئەگەر لە سەر بنەما (هایدگەر)ییەكە قسە لە ((وەرگر)) بكەین دەتوانین بڵێین لە رێگەی هوشیاری بوونی بە بوونی زاتیانەی خۆی پرۆسەی تێگەیشتن فەراهەم دەكات، چونكە بوونی زاتیانەی ((وەرگر)) چركەیەكە لە چركەكانی بوونی راستەقینە، كاری هونەریش چركەیەكی وجودییە، هەر كاتێكیش هەردوو چركەكە بە یەككگەیشتن ئیدی دیالۆگ دێتە ئاراوە، پرسی ترو وەڵامی وەها دێنە دی بە هۆیانەوە حەقیقەتی بوون ئاشكرا دەبێتو (ئینجا) ئەزموونی وجودییانەمان لە نێو جیهاندا گەشە دەكات.

هەروەها ئەگەر بچینە سەر دەقی ئەدەبی كە جیهان تیایدا لە میانی زمانەوە دەردەكەوێت، دەبینین (وەك كاری هونەری) بەهێزی پشێویی نێوان دەركەوتن و شاردنەوە بەرێوە دەچێت، ئەركی تێگەیشتن لێرەدا یەكسانە بە كەشفكردنی ئەوەی دەق لە میانی گوتراوە كردەگییەكانی خۆیەوە نەیگوتووە، ئەو تێگەیشتنە لە نادیار، لە رێگەی ئەو دیالۆگەوە بەرهەم دێت، كە ((وەرگر)) لەگەڵ دەق دروستی دەكات[٢٣].

---

[23]- بڕوانە: ا نصر حامد ابو زید- شكالية القراءة و التأويل- المركز الثقافي العربي- ط٤-١٩٩٦/ الفصل الاول، ص٣٦.

بـەلاّم بـە گشـتی تیـۆری ((پێشـوازی)) قسـە لـە نیـازە جۆراوجۆرەکانی بەیەکگەیشتن و بێ کۆتایی مانا دەکات، قورسـی دەخاتـە سـەر لایـەنی کـاتی خوێندنـەوەو پێشـنیاری ئـەوە دەکـات کە خوێنەران چ جۆرە هەستێك بەرامبەر بە دەقەکان دەخـولقێنن، کـە بـە سـەر کاتـدا دەپـەرێتـەوەو لـە سنوری دەقەکـەدا لـە رستـەوە دەڕوات بۆ رستـە، لـە دێرەوە دەڕوات بۆ دێر، لـە وشـەوە بـۆ وشـە، بۆشاییەکان پڕ دەکاتـەوە، ئامـاژەکـان بـەرهـەمدێنێت، ئـەویش لـەو روانگەیـــەوە کـــە دەکرێتـــە ئامـــاژەی نائاشـــکرا لـــە لایـــەن درێژەکارییەکانی دەقەوە وەکو ئەوەی کە دەیخوێنیتەوە.[٢٤]

کەواتە بەکار هێنانی تێڕوانینـەکانی تیـۆری پێشـوازی ئـەوەیـە کـە تـۆ لێیـەوە دەسـت پێدەکـەیت و ئـەویش شـتێکی بنچـینەیی و دەسـتپێکەرانەیە، یـان بریتییـە لـە کاردانـەوە سـەرەتاییەکانی وەلاّمدانـەوە یەکەمیـەکانت. بێگومـان لـە خوێندنـەوەدا دەشـێ مێشـکی خـۆت سـەبارەت بـە کاردانـەوەت بـۆ بەرهـەمێك بگـۆڕیـت، دەشێ پیادەی ئەزموونی ناکۆك یان هەسـتە جیاوازەکـان بکـەیت، یـان لەوانەیـە مانـا بـۆ بەرهەمەکە بە شێوەیەکی جیـاواز دروسـت بکەیت ئەویش بە هۆی ئـەو دۆزینەوانـەوە کـە دواتـر لـە پرۆسـەی خوێندنەوەدا ئەنجامی دەدەیت، بـۆ نموونـە ئـەوەی لـە دوا بەشـی رۆمانێـك دەیخوێنیتـەوە دەشـێ تێگەیشـتنی ئـەوەی لـە بەشـی

---

[24]- رۆبێرت دیاینی، دایڤد دەچز، ئەبرامز، رێبازەکانی رەخنەیی ئەدەبی، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: عەتا قەداغی، لە بلاّوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢، ل٧٢-٧٣.

یەکەم یان لە ناوەڕاستدا خوێندۆتەوە بگۆڕێت، ئەوەش دەلالەت لــە دینامیکیــەتی خوێندنــەوەی چــالاکانە دەکــات کــە بــیرە گۆڕاوەکانی خوێنەرو هەستکردنەکانی تێیدا بە بنەما دەکرێت.

بەو مانایەش لەو تیۆرەدا وێڕای دیدە جیاوازەکان خوێنەران لــە ڕێگــەی ڕووبــەڕوو بوونــەوەیان لەگــەڵ بەرهــەم، مانــا بــۆ بەرهەمەکــە دروســت دەکــەن، ناکەونــە ســەر نیازەکــانی نووســەر، وەك چۆن بە چاوی رابردووش لە دەق ناڕوانن، چونکە ئەگــەر بە چــاوی رابــردوو لــە دەق بــڕوانن ئــەوە دەق وەك خــۆی نــابینین. کەواتــە نابێــت لــە نێــوان خوێنــەرو دەقــدا هــیچ مەودایــەك وجــودی هــەبێت، چــونکە دەبێــت خوێندنــەوە بــۆ دەق پشــت بــە میراتــی بۆماوە نەبەستێت.

بــەلأم (هــانز رۆبــەرت یــاوس) بــە ســوود وەرگــرتن لــە ڕێبــازە مەعریفیــە جــۆر بــەجۆرەکان دێــت لــە ڕێگــەی ئاوێتــە بــوونی داهێنەرانــەی نێــوان دەق و خوێنــەر، یــان بــە مانایــەکی دیکــە لــە ڕێگەی ((مــاوە جوانکارییــەکان))ی دنیــای دەق و دنیــای خوێنــەر، ئەوەی جێگیرەو ئەوەی پێشبینی دەکرێت، بــەرگری لــە بەخششــە چاوەڕێکراوەکان دەکات.[٢٥]

کەچــی (هۆلانــد) ئاگــایی نووســەر لــە بەرهــەم جیــا دەکاتــەوەو دەڵێــت هــەر یــەك بــۆ خــۆی دەســەلأتی خــۆی هەیــە، دەق هــیچ مانایــەکی نییــە تــەنها ئــەو کاتــە نــەبێت کــە خوێنــەری کــارا

---

[25]-بڕوانە: محمد خرماش، النص الادبي و اشكالية القراءة و التأويل، مجلة/ فكر و النقد المغربي– العدد ٢٠٠٥، ٦٧ .

پرۆسیسەی دەکات، واتە پێویستە بۆ مانا پشت بە خوێنەری کارا ببەستین.[٢٦]

کەواتە لێکدانەوەی تاکە خوێنەرێك بۆ بەرهەمێك دەشێ بگۆڕدرێت لە راستیدا ئەو گۆڕانە لەوانەیە پەیوەندی بە کاتەوە هەبێت (واتە کاتی خوێندنەوە) هەروەها لەرووی مێژووییەوە خوێنەران لە نەوە جیاوازەکان و سەدە جیاوازەکاندا بە شێوەیەکی جیاواز لێکدانەوەی بەرهەم دەکەن، واتە شتی جیاواز بە خوێنەرانی سەردەمە مێژووییە جیاوازەکان دەڵێت ئەویش لە سەر بنەمای پشت بەستن بە پێداویستییە تایبەتییەکان و دیدو بۆچوونی خودی خوێنەرانەوە.

هەروەها (هۆلاند) ئەو کارلێکەرییەی نێوان خوێنەرو نووسەر وەك یەکەیەکی دوانەیی تەماشا ناکات، بەڵکو وەك کۆبوونەوەی نێوان تاك و جیهان وەسفی دەکات.[٢٧]

(ئیبرتۆ ئیکۆ) لە بواری سیمیۆتیکاوە کار دەکات و کردەی خوێندنەوەو تەئویل لای ئەو خۆی لەو سێ قۆناغەدا هەڵدەگرێتەوە:

یەکەم: دەق بەو مانایەی کە رستێك سپێتی و ئاڵو گۆڕییەو قابیلی پڕکردنەوەو تەئویل کردنە.

---

[26]– ولیم راي، المعنى الادبي من الضاهيراتية الى التفكيكية، –ترجمة د. يوئيل يوسف عزيز_ دار المامؤن للترجمة و النشر، بغداد، ل٨٨

[27]–وليم راي، ه.س.پ. ل٨٧

دووەم: خوێنەر بەو مانایەی کە لە کۆمەڵێك دەق پێکهاتووە، خوێنەری مەوسوعییە.

سێیەم: گەیشتنی دەق بە خوێنەر، بە هاوبەشی کردن لە دەق، یان ساتەوەختی ئاوێتە بوونی نێوان دەق و خوێنەر دەژمێردرێت.[٢٨]

قسەکردن لە دەق بەو مانایەی کە هەڵگری کۆمەڵێك ئاڵوگۆڕی و رستێك سپێتییە لەوێوە دێت کە پانتاییەکە لێپراسراوێتی کرانەوەی لەخۆدا هەڵگرتووە، هەر لەوێشەوە خوێنەر جولەو بزاڤو داهێنانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت، چونکە (ئیکۆ) پێیوایە دەق ئامرازێکی سستە، بۆیە داوا لە خوێنەر دەکات لە رێگەی هاوبەشی کردنەوە ئەکتیڤی بکات، ئەو ئاوێتە بوون و ئەکتیڤکردنەی دەق لە رێگەی خوێنەرێکەوەیە کە (ئیکۆ) بە (خوێنەری نموونەیی) ناوی دەبات، ئەو خوێنەرەش دەکەوێتە بەرامبەر ستراتیژیەتی دەقی دانەر، ئەو دانەرەش دەتوانێت ئەو ستراتیژیەتیە هەڵگرێت کە بەردەوام بۆ تواناکان دەگەڕێتەوە، بە دیوەکەی دیکەش خوێنەری نموونەیی بۆ هەمان ئەو توانایانە دەگەڕێتەوە، هەر لەوێشەوە دەکەوینە بەرامبەر خوێنەری ئەزموونگەرییەوە.

کەچی (ئایزەر) سەر بە جوانکاری وەرگرە پرنسیپی تیۆرەکەی بۆ فینۆمینۆلۆژیاو هێرمینۆتیکا دەگەڕێتەوە،

---

[28]-المصطفى عمراني، القراءة و التأويل بين امبرتو ايكو و فولففانغ ايزر، مجلة/ فكر و النقد المغربي- العدد ٦٧،٢٠٠٥ .

ئەگەرچی هەر یەك لە (ئیكۆ)و (ئایزەر) جیاوازی زۆریان لە باكگراوەندی فیكری میتۆدیدا هەیە، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا هەردووكیان سروشتێكی گێڕانەوەئامێزیان هەیە، بە مانایەكی دیكە زۆربەی ئەو مەسەلانەی كە (ئیكۆ) لە بواری خوێندنەوەو تەئویل كاری تێدا كردووە، (ئایزەر) پەرەی پێداوەو دەوڵەمەندی كردووە. بۆ بەشدار بوون لە كارلێكەری نێوان دەق و خوێنەر، كۆمەڵێك چەمكی بەرهەم هێناوە لە پێش هەمووشیان (خوێنەری ناوەكی) كە نزیكە لە (خوێنەری نموونەیی)، ئەو خوێنەرە ناوەكییە خوێنەرێكە بە دوای مانادا دەگەڕێت، بەلآم نەك مانا ئامادەو شاراوەكانی نێو دەق، وەك چۆن بە شێوە تەقلیدییەكەوە چەسپاوە، بەڵكو ئەو مانایەی كە لە كارلێكەری دەق و خوێنەر دەكەوێتەوە، واتە ئەو مانایەی كە وەك "جێكەوتەیەك دەشێ پرۆسیسە بكرێت" لە نوێوە بدۆزرێتەوە،، نەك بابەتێك بێت بشێ دیاری بكرێت و پێوەی ببەسترێیتەوە.

بەمجۆرە ئەركی هیرمینۆتیكا لای (ئایزەر) خۆی لە تەقینەوەی وزە دەلالیە حەشاردراوەكانی نێو دەق هەڵدەگرێتەوە، ئەو تەقینەوەیەش لە رێگەی بەشداری چالاكانەی خوێنەرەوە بە ئەنجام دەگات، بەو مانایەش خوێنەر ئەو بارگە وزەئامێزەیە كە بەردەوام لە هەر خوێندنەوەیەكی نوێدا دەدرەوشێتەوە.[٢٩]

---

[29]- المصطفى عمراني، القراءة و التاءويل بين امبرتو ايكو و فولففانغ ايزر، مجلة/ فكر و النقد المغربي- العدد ٦٧،٢٠٠٥ .

كەواتــە تيـۆری ((پێشــوازی))و ((وەرگــر)) قســەكردنە لــەو ماوەيەی كە دەكەوێتە نێوان دەقو خوێنەر، بەڵام بە قەد ئەوەی لە سەر پێشبينييەكانی خوێنـەر دەوەستێت، ئەوەنـدە گرنگـی بە دەقو نووسەر نادات، هـەروەك ئـەو خاڵـە جياوازانەی كە قابيلی بيروڕای جۆراوجۆرن بە شێوەيەكی بنەڕەتی خۆی لـەو مەودايـەدا هەڵدەگرێتەوە، كە دەكەوێتە نێـوان دەقو خوێنـەرەوە، وەك چۆن بۆچوونی هەڵگرانی ئەو دوو تيۆرە لە بارەی نيازو بابەتگـەرايیو ناســـــنامەی دەقو خوێنـــــەرو مێژووگـــــەرايیو ئــــــەزموون و...جۆراوجۆر دەكەونەوە.

(گـــادامێر) پێيوايـــە پرۆســـەی خوێندنـــەوە دروســـتكردنی پردێكە لـە نێـوان (رابـردوو)و (ئێسـتا)، هـەروەها دەڵێـت ئێمـە كە پرۆسـەی خوێندنـەوە بە ئـەنجام دەگەيـەنين، نـاتوانين لـە فيكـرە ئامـادەو جيـاوازە چەسپاوەكانی نێـو رۆشـنبيريمان دەربـاز ببين، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانين لەو ئاسۆ دياريكراوە مێژووييـەوە بگەينە هەندێك لە تێگەيشتن، كە دەتوانين بە هۆی ئاراستەكردنی هەنـدێ پرشـنگ بـۆ سـەر دەقـە كۆنەكـەوە بـە دەسـتی بهێـنين. بەمجۆرە دەشێ لەساتەوەختی تێگەيشـتنەوە جۆرێك لـە چوونـە نێـو يـەك لـە نێـوان ئاسـۆی پێشـبينيەكانمانو ئاسـۆی نووسـينی رابردوو هەبێت.

هـەروەها دەڵێـت ئێمـە تـەنها هـەوڵی تێگەيشـتنی نـاوەڕۆكی قەسيدە نادەين، بـەڵكو هـەوڵ دەدەيـن ئـەو جيهانـەش بە دەست بهێـنين كـە قەسـيدەكە ئينتمـای دەكـات، يـان دەيخاتـە روو،

هەروەها ئەو باس لەو خاڵەش دەكات كە ئاسۆكانی تێدا بە ناویەكدا دەچن و تێكدەچرژێن.[30]

بەڵام (یاوس) كە یەكێكە لە قوتابیانی، لە پەیوەندی نێوان كاری ئەدەبی و وەرگر پێ لە سەر ئەوە دادەگرێت، كە مانا نایەتەجێ، تەنها لە رێگەی پەیوەندی هاوسێیانە، یان لە رێگەی رێكەوتەوە نەبێت، ئەگەر پەیوەندی هاوسێیانە تەعبیر لە مێژووی ئاوێتە بوونی خوێنەرەكان بكات، یان تەئویلە جۆراوجۆرەكانی خوێنەرانی لەخۆدا هەڵگرتبێت و لە تێگەیشتنەوە رابێتەوە، ئەوە مانای رێكەوتئامێز لە ساتەوەختی تەئویلكردنەوە بۆ كردەی جێبەجێكردن هەنگاو دەنێت. هەڵبەتە ئەگەر ئاوێتە بوونی مێژوویی، چەمكی (جوانكاری وەرگر) بەرجەستە بكات، ئەوە (تێگەیشتن) بۆ (تەفسیركردن)و (جێبەجێكردن) كردەی پەرەسەندنی (درككردن)ی (گادامێر) یمان بیر دەهێنێتەوە.[31]

لای (یاوس) خوێندنەوە جولەیەكی دەمەتەقێئامێزەو هەمیشە بە هۆی بەیەكگەیشتنەوە جولە دەخاتە نێوان بەرهەم و وەرگرەوە، چەمكی وەرگر لای ئەو مانایەكی دوالیزمی هەیە، خۆی لە (پێشوازیكردن)و (ئاڵوگۆڕی)دا هەڵدەگرێتەوە، لێرەدا

---

[30]- بول ريكور /الشعر والإمكان -مجلة (نزوى) العدد (١٥) ص ١٥٥ www.nizwa.com/volume15/p155_160.html حوار مع بول ريكورترجمة: سامح فكري (باحث ومترجم من مصر)

[31]- هانس روبيرت ياوس، جمالية التلقي-من اجل تاءويل جديد للنص الادبي؛ ترجمة: رشيد بنحدو، القاهرة_ط٢٠٠٤،١، ل١٠٤.-

وەرگر بە تێگەیشتنە ئیستێتیکیەکەی لەیەککاتدا دوو ڕەهەندی کاراو بەرکار لەخۆ دەگرێت، واتە دوو ڕووی هەیە، یەکێك ئەو جێکەوتەیەیە کە بەرهەمەکە لە خوێنەردا بەرهەم دەهێنێـەوە، ئەویدیکە چۆنێتی پێشوازیکردنی خوێنەرە بۆ ئەو بەرهەمە (وەلآمدانەوەی خوێنەر) ئەو پێشوازیکردنەش بە پێی خوێنەرەکان جۆراوجۆر دەکەوێتەوە، یان ڕەخنە لە بەرهەمەکە دەگرێت، یان ئیستهلاکی دەکات، یان پێی سەرسام دەبێت، یان تەئویلی ناوەڕۆکەکەی دەکات، یان دووبارە تەفسیری دەکاتەوە، یان چێژی لێوەردەگرێت.

هەروەها مانا نوێیەکانی دەق لە ئەنجامی دوو ڕەگەزەوە دروست دەبن، یەکەمیان ئاسۆی چاوەڕوانی، کە کاری ئەدەبی دەیسەپێنێت. دووەمیان ئاسۆی ئەزموون، کە وەرگر تەواوی دەکات.[32]

ئەگەر کردەی درککردن لای (گادامێر) لە میانی ساتەوەختی تێگەیشتن و تەفسیرکردن و جێبەجێکردن پەرەبسێنێت، ئەوە لای (یاوس) لە زنجیرەیەك مێژووی ئاوێتەبووەوە خۆی دیاری دەکات، ئەو ئاوێتە بوونەش ڕستێك تەئویلاتی جۆراو جۆر دەخاتەوەو (یاوس) بە دەستەواژەی (جوانکاری وەرگر) وەسفی دەکات. بە دیوەکەی دیکەش (جوانکاری وەرگر) لەگەڵ بۆچوونە

---

32-- هانس روبیرت یاوس، هـ.س،پ، ل١٠١.-

مارکسیەکان و ئەو دیدەی کە پێیوایە کەلەپوورو ڕۆشنبیریی بابەتێکە هەمیشە بۆ بەکارهێنان ئامادەیە ناکۆك دەکەوێتەوە.[٣٣]

لە لایەکی دیکە (یاوس) پێیوایە نووسینی مێژووی نوێ بۆ ئەدەب پێویستی بە (پردی تەئویلی) هەیە، چونکە ناتوانین مێژووی هونەر بخەینە دەرەوەی مێژووی پێشوازیکردنەکانی خوێنەرانەوە، بۆیە پێویستە لە سەرمان جوانکاری بەرهەم و وێناکردنە تەقلیدییەکان لە سەر بنەڕەتی جوانکاری وەرگرەوە هەڵبسەنگێنین، کەواتە مێژووی ئەدەب و هونەر هەر تەنها مێژووی بەرهەمهێنانی بابەتی ئەدەبی و هونەری نییە، بەڵکو مێژووی پێشوازیکردنە جزئیەکانی خوێنەریشە لە میانی مێژووی گشتیدا. بەو مانایە لە نووسینی مێژووی نوێوە دەکەوینە نێوان (جێکەوتەی بەرهەم) و (وەرگر)ەوە. بەڵام ناتوانین لە مێژووی وەرگر بکۆڵینەوە، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دان بەوەدا دەنێین مانا لە دەمەتەقێی نێوان دەق و وەرگر دروست دەبێت، لەوێشەو دەگەینە ئەوەی کە کارە ئەدەبییەکان بۆ نەوەکانی داهاتوو شتێك لە گوتنیان پێیە.[٣٤]

دەشێ بڵێین ئەو وێناکردنە تەئویلیێك لە سەر گفتوگۆی نێوان ئێستا و داهاتوو دادەمەزرێنێت، دواجار ئەو درککردنە لە میانی زنجیرەیەکی مێژوویی و مێژووی کارلێك کردنەکانی ماناوە پلە پلە دەبێت، خۆی لە سێ کوچکەکەی (تێگەیشتن) (تەئویلکردن)

---

[33]– هانس روبیرت یاوس، هـ.س،پ، ل١٠٤، ١١٢.

[34]– هانس روبیرت یاوس. هـ.س،پ، ل١٢٣، ١٢٤.

(جێبەجێکردن)ی (گادامێری)دا دەبینێتەوە، هەر لە سەر ئەو بنەمایەش (یاوس) بەرگری لە بەخششە چاوەڕێکراوەکان دەکات، ئەو بەخششەی لە رێگەی کارلێکەری داهێنەرانەی نێوان دەق و خوێنەر دێتە بەرهەم، یان لە نێوان ئەوەی کە جێگرەو ئەوەی کە پێشبینی دەکرێت لە رێگەی مەسافە ئیستێتیکەیەکانی نێوان دنیای دەق و دنیای خوێندنەوەدا.

لێرەدا (یاوس) وێناکردنێکی جیاواز بۆ چەمکی مێژووی ئەدەبی دەکێشێت، لەوێشەوە سنورێك بۆ مەعریفەی ئیستێتیکی و مەعریفەی مێژوویی دادەنێت، بەو مانایەش مێژووگەرایی بە پێی تێڕوانینی (یاوس) لە سەر پەیوەندی پتەوی نێوان دیاردە ئەدەبیەکان دروست نابێت، بەڵکو دەکەوێتە سەر پرۆسیسەکردنەکانی خوێندنەوە، لێرە مێژوونووسی ئەدەبی بەر لەوەی لە سروشتی کارو دیاریکردنی مێژووەکەی بگات، دەبێتە خوێنەر، لە دوتوێی ئەو ناوکۆییەدا مێژووی ئەدەبی پرۆسەیەکی دەمەتەقێئامێزی نێوان بەرهەم و وەرگرە، هەروەها کاری ئەدەبی ئەو کاتە لە کارتێکردن بەردەوام دەبێت، کە بەردەوام خوێنەر پێشوازی لێبکات. بەمجۆرە گەڕانەوە بۆ (ئەزموونی خوێندنەوە) سنورێك بۆ شیانی تەئویلکردن دەسازێنێت.

لە سەر ئەو وێناکردنە (یاوس) کار لە سەر پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە دەکات، کە دەکەوێتە نێوان کاری ئەدەبی و مێژووی بە گشتییەوە، یان نێوان مەعریفەی جوانکاری و مەعریفەی مێژووییەوە، بەو مانایەش کاری ئەدەبی هەر تەنها لە رێگەی پشکنینی بەرهەمەوە ئاشکرا ناکرێت، بەڵکو لەوێوە چارەسەر

دەكرێت كە پرۆسەیەكی دەمەتەقێئامێزی نێوان دەق و وەرگرەو بە لۆژیكی پرسیارو وەڵامەوە بەندە، هەڵبەتە بۆ ئەو لۆژیكە دووبارە هانا بۆ (گادامێر) دەبات، لای (گادامێر) تێگەیشتنی كاری ئەدەبی و هونەری بە تێگەیشتنی پرسیارەكەیەوە بەندە، ئەو پرسیارەی كە رووبەرووی خوێنەر دەكرێتەوە، هەروەك لای (ئایزەر)یش دەوڵەمەندی ئەدەبی كلاسیكی لەوەدایە كە بە درێژایی مێژوو یەك پرسیار رووبەرووی خوێنەر دەكاتەوە، لە بری ئەوەی بەردەوام پرسیاری نوێ تەرح بكات و گوێیان بە ئاوازێكی دیكە بلەرێنێتەوە، هەر هەمان پرسیار دەخاتەوە لە لێی راهاتوون و بۆ درككردن ئەرك و ماندووبوونی ناوێت، بەڵام (یاوس) ئەو پەیوەندییە سەرەوژێر دەكاتەوەو وای لێدەكات كە خوێنەر هەڵگری پرسیار بێت و چاوەڕێی وەڵامی دەق بكات، بەمجۆرەش مێژووی خوێنەرەكان لە یاری دەمەتەقێئامێزە كراوەكانی پرسیارو وەڵامدایە.

(یاوس) دەڵێت: لە زۆربەی بارەكاندا پرسیارو وەڵام لە میانی مێژووی تەئویلی هەر كارێكی ئەدەبیدا بە شاراوەیی دەمێنێتەوە، كاریگەری بەرهەم و وەرگریش لە دەمەتەقێی نێوان خودی ئامادەو گوتاری رابردوودا بە یەك دەگەنەوە، ئەو گوتارە لە گوتنی ئەو شتە بەردەوام نابێت بۆ ئەو خودە، یان شتێك دەڵێت كە ئەو نییە، ئەوەش تەنها ئەو كاتە كەشف دەكرێت كە خودی

ئامـاده وەڵامـە شـاراوەکانی گوتـاری رابـردووی درککردبێـت و بزانێت وەڵامەکەی کامەیە.[٣٥]

بـەمجۆره دەق دەبێتـە شـوێنی کۆمـەڵێك پێشـبینیکردن، لـە میـــانی ئـــەو پێشـــبینیکردنانەوە دەگەینـــە چـــەمکی (لێکدوورکەوتنەوە) کە (پۆل ریکۆر) بەرهـەمی هێناوە، لە میانی ئەو چەمکەوە دەق لە نیازی نووسەرەکەی دوور دەکەوێتەوە، هەر وەك بـــەردەوامیش لـــە نیـــازی خـــودی خوینـــەرانیش دوور دەکەوێتەوە، کەواتە کردەی دوورکەوتنەوە لە نێوان دنیای دەق و دنیای خوێنەر جێبەجێ دەبێت، یەکەمیان، دنیای تایبەتە، دوور لە کاریگەرییە واقیعیەکان و نیازی نووسەرو مەیلە دەروونیـەکان، چـونکە ئـەوەی دەق دەلالـەتی لێـدەکات لەگـەڵ ئـەوەی نووسـەر دەیەوێت یەك ناگرێتەوە. دووەمیان، دنیای خوێنەرە، بەرەو ئەوە دەچێت کە پرۆسەی خوێندنەوە خۆی لە جێبەجێکردنی کردەی شیانی دەلالەتئامێزەکانی دەق هەڵدەگرێتەوە، بەو مانایـەش دەق بـۆ بەرهـەمهێنان و تـەئویلکردن دەگەڕێتـەوە، یـان بـۆ ئاسـۆی چاوەڕوانی خوێنەر دەگەڕێتەوە.[٣٦]

کەواتە دەشێ بڵێن لە نێوان (رابردوو) و (ئێستا) ماوەیـەك بۆ ونبـوون هەیـە، وەك چۆن ماوەیـەك بـۆ خوێنـەری ئەزموونگـەراو و خوێنـەری نموونـەیی و خوێنـەری نـاوەکی هەیـە، بـەڵام ئـاخۆ ئـەو

---

[35]– هانس روبیرت یاوس. هـ.س،پ، ل١٢٥.

[36]–بۆ زێتر شارەزایی بگەڕێوە بۆ: محمد القاسمي، القراءة و التاويل في النقد الادبي الحديث، مجلة (فكر و النقد) العدد (٦٧) الغرب.

ونبوونەی (دڵدار) پەیوەندی بەو ماوەیە دایە، یان پەیوەندی بەو پێشوازییە سپی ئامێزە یان بۆشاییەوە هەیە کە خوێنەر یارییەکانی خۆی تێدا بە ئەنجام دەگەیەنێت هەڵبەتە ئێمە هەوڵدەدەین بەشێك لە خوێندنەوەکەمان لەسەر ئەو خاڵە دابمەزرێنین، واتە بۆ ئەو خاوبوونەوەیەی نێوان دێرەکان، پەردە لە سەر بێدەنگییەکانی (دڵدار) یان کەشفکردنی ئەو زمانەی کە خۆی لە پشت گوتن و فۆرم و ئاخاوتندا حەشار داوە لە نێو سروودی (ئەی رەقیب) هەڵدەدەینەوە، بەڵام پێویستە بزانین ئەو مانایەی کە کەشف دەکرێت، مانایەکی لۆژیکی نییە، بەڵکو شێوازێکە بۆ تێگەیشتنی دنیا و شتەکان، بەڵام ئەگەر لە لایەك ئەو تێگەیشتنە بە شێوازەوە بەند بێت، لە لایەکی دیکە دەشێ حاڵەتێکی نێگەتیف بێت و ئەو حاڵەتە نێگەتیفەش لە گەیشتن بە وێناکردنێکی جێگیرەوە هەڵقوڵابێت، ئەو حاڵەتە نێگەتیفە کە خوێنەر لە بەرامبەر وشەکان پێیدەگات، جۆرێك لە سەرسامی دەخاتەوە، ئەو سەرسامییە ئەگەر وەك لە بڕگەی یەکەم هاتووە شێوازێك بۆ تێگەیشتن لە دنیا و شتەکان بخاتەوە، ئەوە لە بڕگەی دووەمدا تەعبیر لە ململانێی فیکرەکان دەکات، هەر لەو کەشفکردنەشەوە بەیەکگەیشتن دروست دەبێت.

کەواتە (دڵدار) لە لایەك دەیەوێت لە رێگەی عەقڵ و لۆژیکەوە کوردمان پێبناسێنێت، لە لایەکی دیکە هەوڵدەدات لە رێگەی هەست و وزە تایبەت و شاراوەکانیەوە فەزایەك لە چاوەڕوانی و وڕوژان دروست بکات. بەڵام دەشێ ئەو جۆرە لە وڕوژان و چاوەڕوانییە لە پەیوەندی لەگەڵ زماندا وەك گوتمان لە سەر

 

ونبـوونی هەسـتی خـودی نووسـەر بکەوێتـەوە، چـونکە ئـەو نەشـوەیەی کـە بـە خوێنـەری دەبەخشـێت، ئەگەرچـی بەشـێکی پەیوەندی بە ونبوونی جەستەی (دڵدار)ەوە نییە، بەڵام بەشێکی لە سەر ونبوونی جەستەی (دڵدار) رادەبێتەوە، بە مانایەکی دیکە ئەوە جەستەی (ئەی رەقیب) نییە، چێژو نەشوە بە جەستەی خوێنەر دەدات، بەڵکو ئەوە لە روویەك لە رووەکان بەریەککەوتنی هەستی خوێنەرو بێدەنگییە، ئەو بێدەنگییەی، کە لەرێگەی بزاڤە تایبەتی و نادیارەکانییەوە هەستی خوێنەر دووچاری ئاوڕدانەوە دەکـــات، ئاوڕدانەوەیـــەك کـــە بـــە هیرارتیکـــی (-heterodoxyهرطقة)[37] بێدەنگییەوە بەندە، (هیرارتیکی بێدەنگی جگـە لـە تـەجاوزکردنی (بـاو) شـتێکی دیکـە نییـە)[38]. هـەر لەوێشەوە لە نێوان چاوەڕانی و وڕووژانەوە سپێتی دەق بەرەو چێژو کۆمەڵێك خوێندنەوەی کراوە دەکاتەوە، بە مانایەکی دیکە وەك خوێنـەری چـوارەم دەڵێـت:– ئـەوە ونبـوونی دەسـەڵاتی (دڵدار)ە، نەشوەی لێدێتە بەرهەم.

وەك گوتمان لە پرۆسیسە کردنـی خوێندنـەوەدا ئیشـکالییەتی خوێندنـەوە دەکرێـت بـە دوو بەشـەوە، یەکـەمیان پشـت بە چێژ دەبەستێت، لە زۆربەی کات لەسەر بنەمای زمانی هەڵچوونئامێز

---

37– heterodoxy: هرطقة: ابتداعي.

38– ابراهیم محمود/ جمالیات الصمت/ه.س.پ/ل٣٧. لێرەدا ئاخۆ بێدەنگی (سروشت) لە رووی نەخستنەرووی دەستەواژەکانییەوە، لە رووی نەخستنەرووی فۆرم و شێوە بوونە جۆر بەجۆرەکانییەوە، ئەویش جۆرێك نییە لە هەرتەقە. بۆ بەدواداچوونی زێتر بڕوانە هەمان سەرچاوە پێشوو.

رادەبێتەوە، دواجار لە ڕێگەی خوێندنەوە بە خۆشی دەگاتو بە خوێنـــەری خوێنـــەران نـــاو دەبرێـــت. دووەمییـــان خـــۆی لـــە هیرمۆنیتیکـای خوێندنـەوە هەڵدەگرێتـەوە، لـە خوێندنـەوەدا بـە هەوڵـــەکانی خـــۆی پەنجـــە دەخاتـــە ســـەر بەرجەســـتەکراوە ڕەمزییـەکانی جەسـتەی دەق، بـەدوای جەسـتەی دەقـدا دەڕواو کۆمـەڵێك بنـەما بـۆ خوێندنـەوە دەدۆزێتـەوەو هـەر لەوێشـەوە لـە ڕێگـەی زمـانی ڕەمزئـامێزەوە تـەئویلی جـۆراو جـۆر بـۆ دەق دادەمەزرێنێت، واتە وەك پیشە لە کردەی خوێندنەوە دەڕوانێت، ئەو خوێنەرە بە خوێنەری ڕەخنەگر ناوزەد کراوە.

خوێنـەری ڕەخنـەگر لـە سـەر دوو بنـەما کـار دەکـات، یەکـەم: مەعریفـــەو ڕۆشـــنبیریی دەوروبـــەر. دووەم: ئـــەو مەعریفـــەو ڕۆشـنبیرییەی کـە لـە نـاوەوەدا شـاراوەیە. ئـەو دووانـەش واتـە (دەوروبـەر/شـاراوە) یـان (مەرجـەع/ژینگـە) ئـەو کەشـفکردنانەی خـــوارەوەی لێدەکەوێتـــەوە: ڕاڤـــەکردنێك کـــە تـــەواوی بزاڤـــە وردەکارانەکەی ژیان دەگرێتەوە. ئەو ڕاڤەکردنەی کە ڕابردوومـان بـیر دەخاتـەوە. ئـەو ڕاڤەکردنـەی کـە تـەجاوزی دنیـابینی کـۆن دەکات لە پێناو بونیادنانی دنیابینی نوێ. ڕاڤەکردنێك کە بـەرەو نادیار هەڵماندەدا، بێ ئەوەی هەڵبژاردنی مەبەست بێت، جا ئـەو نادیـارە دێ، یـان نایـە، بـە مانایـەکی دیکـە حیکایـەتێك دەکـات، دەشێ ئەو حیکایەتـە ڕوو بـدات یـان ڕوونـەدات. دوایـن ڕاڤـەکردن ڕاستەوخۆ لەدایکبوونی خوێنەرێکمان بیر دەخاتـەوە، کـە دەشـێ ڕووی دووەمـی خوێنـەری خوێنـەران بێـت، بەشـێکی زۆری ئـەو بیرخستنەوەیەش پەیوەندی بە نادیاریو بێ سنوورییەوە هەیـە،

وەك چۆن پەیوەندی بە ساتەوەختی ڕوودانی خوێندنەوەو چێژی خوێندنەوەدا هەیە.

دەمەوێت بڵێم بەر لەوەی بچینە نێو بابەتەکەوە دەبێ بڕوامان بە خوێندنەوەی جیاوازو تەئویلی جیاوازەوە هەبێت، واتە لە نێوان (خوێنەرو خوێنەر/ ڕەخنەگرو ڕەخنەگر) جیاوازی جۆراو جۆر هەیە، یان بە میتۆدەکانەوە دەلکێت، بۆ نموونە کاتێك قسە لە پرۆسیسەکردنی بونیادگەرانە دەکەین دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت، کە بونیادگەرەکان نووسین بە بونیاد دادەنێن، بونیادی نووسین لای ئەوان زمانە، واتە بە بڕوای ئەوان دەق مانای لە نێو خۆیدایە، واتە دەبێت مەرجی تەفسیرکردنی لەنێو خۆیدا بێت، وەك (بارت) دەڵێت: بارمتەی خۆی بێت.[٣٩]

کەواتە مێژووی ئەدەبی لای بونیادگەرەکان مێژووی گەشەکردنی زمانە، لەو ڕووەوە تێگەیشتن لە دەق کردەیەکە بونیادنانی ماناو بەرهەمهێنانی مانای دەگەیەنێت، نەك کەشفکردن. بەڵام لە تیۆری ((وەرگر))و ((پێشوازی)) بە تایبەتی لای (یاوس) گەشەکردنی ئەدەبی دەکەوێتە دەرەوەی بونیاد.

کەواتە چەمکی مێژووی ((وەرگر))یش بە هۆی ئاسۆی (پێشبینیەکان)ەوە تەرجەمە دەکرێت، واتە بە هوشیاری نوێوە

---

[39]- د.بشرى موسى صالح، نظرية التلقي اصول و تطبيقات، ط١ بغداد (١٩٩٩) ل (٢٩).

بەندە، ئەو هوشیاریەش بە ماوەی نێوان پێشبینیەکانەوە ناوزەد دەکرێت. وەك چۆن دەشێ ((وەرگر)) ئاسۆکانی خۆی بگۆڕێت.[40]

لێرە هەوڵدەدەم بە سوود وەرگرتن لە میتۆدە نوێیەکانی رەخنە، بۆ خوێندنەوەی (ئەی رەقیب) دەسنیشانی پێنج جۆر لە خوێنەران بکەم، خوێنەرێکی کوردی کە ناسیونالیزمانە بیر دەکاتەوەو لەگەڵ وزەو پەیوەندییە بەرجەستەکانی رەمزی ناسیونالیزمەوە دەکەوێتە دانوستان و چێژ وەرگرتنەوە، ئەو چێژە بە فیکرەی جوانییەوە بەند نییە، بەڵکو دەشێ راستەوخۆ پەیوەندی بە هەستی نەتەوەایەتی و بە کەڵەگایی تێڕوانینی ((کۆ))و دەلالەت و مانا کەڵەکەکراوەکانی کۆو دەسەلاتی تۆتالیتێرانەی نەتەوەو یەکێتی نەتەوەو زمانی میللییەوە هەبێت، یان بە مانایەکی دیکە پەیوەندی بە کوتبڕی نێوان دال و مەدلولی دەقەوە بێت، لەوێشەوە دەسەلاتی زەمەن و وێنەی جێگیرو دابڕاو بەرجەستە دەکات، کە جگە لە رووکار هیچی دیکە ناناسێت و هەرگیز لە توانای دانییە پرۆسیسەکردن لەگەڵ ئەویدیکە بە ئەنجام بگەیەنێت، بەڵکو بەردەوام وەك رەهەندێکی مێژوویی ئامادەگی خۆی لە نێو بونیادی کۆمەڵگەدا دەنوێنێت و هەژموونی شێوازگەرییانەی خۆی جارێك لە رێگەی دووبارە کردنەوەی دەنگ و پێکهاتە زمانە میللیەکەو جارێکی دیکەش لە رێگەی دووبارەکردنەوەی دەلالەتەکانەوە ئاراستە دەکات، بۆیە

---

[40] – د.بشرى موسى صالح، نظرية التلقي اصول و تطبيقات، ط١ بغداد (١٩٩٩) ل٣١.

هەست دەکەین بەر لەوەی وەك ئیبداعێکی شیعری بێتە دەست وەك گوتارێکی ناسیونالیانە ژانوژوارە نەتەوەییەکانی دەخاتە روو، ئەو ژانوژوارەش دەکاتە تیشکۆی دەلالەتەکانی و لەگەڵ دەستەواژەکانی دیکەی هاوشانیان دەکاتەوە، هەر لەوێشەوە پەیوەندی بە ملکەچبوونی خوێنەری ناسیونالییەوە دەکات.

خوێنەرێکی ئایینی، کە دەشێ (ناکوردی) بێت، دەکەوێتە بەر لێشاوی مۆدیلێکی دیکەی تێڕوانین و دنیابینی و بیرکردنەوەی زمانی دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی و هەمیشە لەگەڵ زمانی (ئەی رەقیب) دژ دەکەوێتەوەو گرژبوونەوەو پەرچەکردار لە یەکەمی جیا دەکاتەوە، پێیوایە ئایدیۆلۆژیا وەك چۆن دەستی لە بەرجەستەکردنی عەقڵیەتێکی نائایینیدا هەیە، بە هەمان شێوە دەستی لە پیسکردنی شیعریش دایە. دژ کەوتنەوەی ئەو خوێنەرە راستەخۆ پەیوەندی بە نیازی نووسەرەوە هەیە، چونکە ئەوە زاڵبوونی نیازی نووسەرە وا دەکات کوتبڕییەك بکەوێتە ماوەی نێوان دال و مەدلولەوە، یەکێك لە نیشانە هەرە سەرەکییەکانی ئەو کوتبڕیەی نێوان دال و مەدلول بەرزبوونەوەی ریتم و چڕکردنەوەی دەلالەتخوازییە، سەرەڕای زاڵبوونی شێوازی دەربڕین.

خوێنەری سێیەم، کە چەپگەرایە وخاوەن بیروڕایەکی جیاوازو تێڕوانینی جیاوازەو ناتوانێت لە بەدواداچوونی ماناو دەلالەتەکان بیر لە جیاوازی چینایەتی نەکاتەوەو بە چێژو خۆشی بگات. خوێنەری ناسیونالی و خوێنەری چەپگەرا لە خاڵێکی جەوهەری بەیەك دەگەنەوە، ئەویش ئەوەیە کە

هەردووکیان بڕوایان بە تۆتالیتێرییەت و پەرگیری هەیەو بە ناوی هەمووان قسە دەکەن و هەوڵدەدەن بیرکردنەوەی خۆیان بە سەر تەواوی خوێنەرە جیاوازەکاندا بسەپێنن.

بەلأم خوێنەری چوارەم، خوێنەرێکە هەوڵدەدات لە رێگەی وێناکردنەکانی ئیرۆسییەتی ناخی (دلدار)و خورافاتی مێژووییەوە ئەو فەزا نادیارو شێواوو شاراوەیە کەشف بکات، کە لە تەماهیبوونی (دلدار) بەرەو وسبەلێکراوەکانمان دەباتەوە، یان لە ونبوونی دەسەڵاتی (دلدار)ەوە مێژووی کوردی بەرجەستە دەکات.

هەڵبەتە خوێنەری چوارەم نە راستەوخۆ پەیوەندی بە دەلالەتە رەمزییەکانی خوێنەری یەکەمەوە هەیە. نە پەیوەندی بە پەرچەکردارو دژبوونەوەکانی خوێنەری دووەم و سێیەمەوە دەکات. بەڵکو پەیوەندی بە جیاوازی خەیاڵ و وزەی شاراوەی نادیارو رۆحی و بیرکردنەوەدایە، هەر لەوێشەوە پەیوەندی بە ئاسۆی پێشبینیەکان و خاوبوونەوەی زمانی هەڵچوونئامێزی سروودی (ئەی رەقیب)ەوە دەکات.

خوێنەری چوارەم دەشێ بەرووی دووەمی خوێنەری پێنجەم، یان خوێنەری خوێنەرانەوە پەیوەست بکەین، رەنگە یەکێك لە جیاوازییە دیارەکانی لەگەڵ خوێنەری پێنجەم لەوەدا بێت، کە وسبەلێکراوەکان بەر لەوەی بە نەستی (دلدار)ەوە پەیوەست بکات، بە تەماهیبوونی (دلدار)و لەوێشەوە دەیلکێنێت

بـه(دەروونـی گـەل)[41]ەوە ، کەواتـە خوێنـەری چـوارەم بـۆ خوێندنـەوەی سروودی (ئەی رەقیب) لـە لایـەك لـە تـەماهیبوونی (دڵـدار) لەگـەڵ کـۆو ونبـوونی دەسـەلاّتی (دڵـدار)، وەك مـرۆڤ دەردەکـەوێت، لـە لایـەکی دیکـە لـە سـەر بنـەمای رەمـزە مێژووییەکانـەوە بـە سـادەیی زمـانی نووسـین و ئـەو کۆمەڵـە زانیارییە وەسفیانەوە خۆی پەیوەست دەکات، کە خەڵك لـە سەر بنـەمای (بۆمـاوە) شـاراوەکان، یـان رۆحییـەکان بۆخۆیـان وێنـای دەکەن، یان وێناکردنی خەڵکە لە چاوی خۆیانەوە، بە دیووەکەی دیکەش وێناکردنی خۆێنەری چوارەمە لە چاوی خۆیەوە، (واتـە دەشـێ بـەرەو جۆرێـك لـە (نێـودژی ئـەدەبی)[42] و (خورافـات)مـان بکاتەوە، چونکە لە لایەك قسەکردن لە مێژووی کوردی تا ئێستا بـە قـەد ئـەوەی خورافیانـە دەکەوێتـەوە، ئەوەنـدە هـەڵگری

---

[41]-بەکار هێنانی رۆحی گەل (نەفسی شەعبی) پەیوەندی بە جیاوازی جینایەتییەوە هەیە، بۆ زێتر شارەزایی بڕوانە:- يوري سوكولوف/ الفولكلور قظايا و تاريخة/ ترجمة/حلمي شعراوي-عبدالحميد حواس/مراجعة/الدكتور:عبدالحميد يونس.الهيئة المصرية العامة للتاليف و النشر ط/١٩٧١. ل١٩.

[42]-مەبەست لە نێودژی ئەدەبی سەیرکردنی (ئەی رەقیب)ە لە نێوان ئەدەبی هونەری و ناهونەری، یان جیاکردنەوەی شێوەیەکی تایبەتی ئیبداع، کە لە ئیبداعی ئەدەبی جیا دەکەوێتەوە، بۆ ئەو جیابوونەوەش پشت بەو حەقیقەتە دەبەستن، کە دەقی فۆلکلۆری دەقێکی جێگیر نییە، بەڵکو لە کۆمەڵێك دەق پێکهاتووەو دەکەوێتە بەر گۆڕان، بە مانایەکی دیکە ناکەسییە، بەلاّم بەرهەمی ئەدەبی بە تەواوی دانەری دیارە و دەقێکی جێگیرە. بڕوانە:-الفولكلور قظايا و تاريخه/ه.س.پ. ل٢٤.

قسـەکردنێکی یەکلاکـەرو زانسـتیانە نییـە) لـە لایـەکی دیکـە لـە نێـوان دڵنیـایی، کـە سـەر بـە واقیعێکـی چەسـپاوە، لـە نێـوان مانـەوەی زمـانی نـاوەوەی (دڵـدار) کـە سـەر بـە ئیرۆسـییەت و هونەرە، خوێنەری چوارەم درێژە بە وێناکردنەکانی نێو خەیاڵی خۆی دەدات.

ئەگـەر ئـەو جـۆرە لـە خورافـات خوێنـەری چـوارەم، لـەرووی (ئەفسـانە/رۆح)ییـەوە[٤٣]، (وێـرای دەسـتلێدانەکانی ئـایین لـە سروشـت و ئایـدیۆلۆژیا لـە ئـایین) و هـەروەها لـە رووی خـەیاڵی خوێندنـەوەوە (نـەك بیرکردنـەوە)[٤٤] کـەمێك لـە (خوێنـەری ئایینگـەرا-چـەپگەرا) نزیکمـان بکاتـەوە، ئـەوە لـە رووی تـەماهیبوونی (دڵـدار) بـە هەسـتی کـۆو بەرجەسـتەکردنی ئـەو کۆمەڵە زانیارییـە وەسـفیانە بـەو زمانـە میللیـەوە فۆلکلۆرمـان بیر دەخاتەوە، بە مانایەکی دیکە ئەو زمانە میللیئامێزە لە پەیوەندی لەگەڵ خۆیدا، لەگەڵ فۆلکلۆردا دەتوانێت بناغەیەکی بە هێز بێت بـۆ نزیکبوونـەوەمان لـە هەسـتە دەسـتە جەمعیـەکان و فۆلکلـۆر،

---

43- لە مەسەلەی (ئەفسانە/رۆح) دووچاری ئیشکالییەتی ئەوە دەبین، کە ئایا رۆح پێش ئەفسانە دەکەوێت، یان ئەفسانە پێش رۆح دەکەوێت، ئەو ئیشکالیەتەش دووچاری ئیشکالییەتی ئەسڵی ئایینمان دەکاتەوە. (فریزەر) بەرگری لە مەسەلەی سیحر بەر لە ئایین دەکات. بڕوانە:- الفولكلور قظايا و تاريخة/ل١٠٩.

44-مەبەست لە خەیاڵی خوێندنەوە رەهاکردنی بیرکردنەوەیەو بە ئازادییەوەوە دەلکێت، بەڵام بیرکردنەوەی خوێندنەوە سنووردارکردنی خەیاڵە لە میانی بیرکردنەوەیەکی جێگیرو دیاریکراودا

لەوێشەوە بەردەوام وەك ناسنامەیەك مەیلی كوردانەی خۆی بلاو دەكاتەوەو تەنانەت پارێزگاریش لە هەندێك دابونەریتی كوردانە دەكات.

كەواتە خوێنەری چوارەم لەوێوە (ئەی رەقیب) وەك (فۆلكلۆری)[45] كوردی تەماشا دەكات، كە هەڵگری زمانێكی میللی و دەنگدانەوەو تێڕوانینی رابردووە، واتە بەر لەوەی

---

[45]–لەوێوە دەڵێم (فۆلكلۆر) كە هەموو ئەو یەكانەی كە باسمان كردن و باسیان دەكەین رەنگە بە جۆرێك لە جۆرەكان پەیوەندی هاوبەش و توندو تۆڵ بە یەكەوەیان گرێ بدات، یان یەكەی كیانی و سەربەخۆو جیاوازو تایبەتێن بە نەتەوەیەك، یان ناوچەیەكی دیاریكراو، بۆ نموونە تەماهیبوونی (دڵدار)، زمانی ریتم ئامێز و ساكاری (ئەی رەقیب) بەرجەستەكردنی رەمزەكان، كە بە گشتی چ وەك واقیع و دەركەوتەیەكی مرۆڤایەتی، چ وەك خەیاڵ پاسەوانی بوونی كوردی دەكەن، لەگەڵ هەموو ئەوانیدیكە كە بە رابردووەوە پەیوەستن. كەواتە لێرەدا وشەی فۆلكلۆر لە (ئەی رەقیب) بە پارێزگاریكردنی ئەو رەگەزانەوە دەلكێت، كە كورد هەمیشە دووبارەیان دەكاتەوە، ئەگەرچی وەك چەمك و وەك وەزیفە كۆمەڵێك گۆڕانیان بە سەردا هاتووە، بەلأم لە رۆحی كوردی، یان لە نەستی كوردیدا بێ ئەوەی ئەو جیاوازییانە لە بەر چاو بگیرێت بە هەمان شێوەی پێشوو پارێزگاریان لێدەكات و پرۆسیسەیان دەكات، بۆتە شێوازێك لە شێوازەكانی بەرگریكردن لەخۆ، بەردەوام لە سەری دەژین.

وەك زانایانی ئەنترۆپۆلۆژی سەدەی نۆزدەم دەڵێن تەعبیرا ألە تەواوی رۆشنبیری میللەتێك دەكات.(بڕوانە: المدخل الانثرولوجي لدراسة الفولكلور– ل٧. هەروەها بۆ زانیاری زێتر بڕوانە: د. ئەحمە عەبدولرەحیم نەسر– الادب الشعبي و العادات و التقاليد الشعبيه/ پێگەی گوگول– یان magazine/002/m00213a.htm

خوێندنەوەی نوێو فەزایەکی نوێ بۆ بیرکردنەوەو چێژو خەیاڵی خوێنەر دروست بکات، یادەوەری لە بەری دەکات، هەڵبەتە ئەوەش پەیوەندی بە (حیکمەتی گەل)[٤٦] و زمانی گەلو عەقڵانیەتی گەلو یەکێتی ناسیونالییەوە هەیە، بەر لەوەی پەیوەندی بە تاكو ئیبداعو ئازادییەوە هەبێت.

خوێنەری پێنجەم، خوێنەری خوێنەران، ئەو خوێنەرەیە، کە هەوڵدەدات خوێندنەوەیەکی سایکۆلۆژیانە بۆ ئەو فەزا نادیارو شێواوو پەنهانە بکات، کە دەکەوێتە نێوان بێدەنگی (دڵدار)و سپێتی لاپەڕەوە، لەوێشەوە دەیەوێت تەواوی ماناو دەلالەتە جێگیر بووەکانی (ئەی رەقیب) هەڵوەشێنێتەوەو بێدەنگی و جوانی و ئاگایی و رەوانبێژی و هیرارتیکییەتی بێدەنگی و وسبەلێکراوەکانی ناخی (دڵدار) بخاتە شوێنیانو وەبەر خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەیان بدات، کۆمەڵێك ماناو دەلالەتی جیاواز بەرهەم بێنێت، کە تەواو لەگەڵ ماناو دەلالەتە بۆماوەو

---

[46] –فۆلکلۆر وەك بەرهەمێکی زارەکی، نووسراو سەیر دەکرێت، دەبێتە لایەنێك لە لایەنەکانی دراسەکردنی ئەدەبی. یەکەمین جار لە لایەن (ولیەم تۆماس) لە ساڵی (١٨٤٦) وەك زاراوەیەکی زانستی ناسرا، ئەو وشەیە بە (حیکمەتی گەل) یان (مەعریفەی گەل) وەرگێردراوە. ئەڵمانییەکان فۆلکلۆر بە لێکۆڵینەوەی نەتەوەیی لۆکاڵییەوە پەیوەست دەکەن. بەڵام فەرەنسییەکان بە گێڕانەوەیەکی خارقی گەل دەیژمێرن. هەروەها توێژەری فەرەنسی (ڤان ژینێت) فۆلکلۆری بە ئەنترۆپۆلۆژیا داناوە. بڕوانە: الفولكلور قظاياه و تاريخة– هـ.س.پ. ل١٧/١٨.

باوو جێگیرەکان پێچەوانە دەکەونەوە، هەر لەوێشەوە دەشێ جۆرێکی دیکە لە نەشوەو خرۆشان بە خوێندنەوە ببەخشێت.

بە مانایەکی دیکە ئەو نەشوەو چێژو خرۆشانەی خوێنەری پێنجەم پەیوەندی بە جوانی بێدەنگییەوە هەیە، یان پەیوەندی بە ونبوونی هەستی (دڵدار)ەوە هەیە، بێدەنگی و هەستێك، کە ڕووبەڕووی پرنسیپی واقیعی (باو) دەوەستێت، کە پرنسیپی کۆنترۆڵکردنە، بەلاّم وەك گوتمان چێژو نەشوەی خوێنەری چوارەم بەشێکی زۆری پەیوەندی بە ونبوونی دەسەلاّتی (دڵدار)و خەیاڵی خوێندنەوەوە هەیە. بەلاّم لە کۆی وزەی سپێتی و جولە تایبەت و شاراوەکانی ئەو خەیاڵ و هەستەوە جۆرێك لە شپرزەیی دێتە ئاراوە، ئەو شپرزەیە، بەرەو بێدەنگیمان دەکاتەوە، خودی ئەو شپرزەییەی خوێنەری چوارەم، دەق و خوێنەری پێنجەم بەرەو جوانی داپۆشراوو وسبەلێکراوەکان و سپێتی لاپەڕە رابەرایەتی دەکات.

جوانی بێدەنگی هەوڵێکە بۆ بڕینی داخراوو ڕێگە پێنەدراوەکانی دەسەلاّتی چەسپاو، هەر لەوێشەوە هەوڵدەدات لە دەرئەنجامی کەشفکردنی هەموو نادیارو شاراوەو ڕۆچووەکانی نێو دەق بکۆڵێتەوە.[47] بەلاّم چۆن دەچینە نێو جوگرافیای بێدەنگییەوە؟

لە سەرەتادا گوتمان هەوڵدەدەین قسە لە دوو جۆر بێدەنگی بکەین، پرسیاری خوێنەر دەشێ ئەوە بێ، کە ئەو دوو جۆرە لە

---

47- جماليات الصمت/ هـ.س.پ/ ل١١/١٢.

بێدەنگی کامانەن؟ ئایا چۆن رووخساری بێدەنگی وەك ئاگاییەك، یــان رەوانبێژییــەك، یــان جوانییــەك... بەرجەســتە دەکــەین؟ دەسەلاّتی بێدەنگی، کارفرمای بێدەنگی....هتد چی دەگەیەنێت؟

سـەرەتا بێـدەنگی هـەبوو. ئـەو رسـتەیە بـەرەو بێدەنگییـەك رابەرایەتیمان دەکات، کە تا سنوورێکی زۆر کاریگـەری خۆی بە ســەر شــتەکانەوە پرۆسیســە کــردووە، وەك چــۆن بــەردەوام هەوڵیـداوە جێکەوتـەی خـۆی هـەبێت. کەواتـە هەمیشـە لـە نـاخی ناخـەوەی ئاگاییـەوە بێدەنگییـەك خۆی حەشار داوە، بـەلاّم چۆن دەتـوانین ئـەو بێدەنگییـە ئەکتیفـە لـە بێـدەنگی نائـەکتیف جیـا بکەینەوە؟!.

ئەگـەر دەنـگ لـە دوتـوێی مانـاو دەلالەتەکانییـەوە دەسـەلاّتی خۆی پرۆسیسـە بکـات، ئـەوە بێدەنگی لـە رێگـەی جیابوونـەوەی لـەو دەسـەلاّتەوە فەزایـەکی داخـراو بۆخـۆی دەسـازێنێت. بـەلاّم بێدەنگیــەك هەیــە دەبێتــە کۆیلــەی دەنــگ، واتــە کاتێــك دەنــگ کۆمــەڵێك رێســا و یاســا دادەنێــتو تــەواوی رەمزەکــان بۆخــۆی دەبات، لـە بەرامبـەر ئـەوە بێـدەنگی ناوبراو خـۆی ئەوەنـدە بچوك نیشــان دەدات، کــە جگــە لــە بــەجێهێنانی فەرمانــەکانو ملکەچبوونی فەرمانەکان ئیتر شتێکی دیکە بە ئـەرکی خـۆی رەوا نابینێـت، ئـەو بێدەنگییـە نـە توانـای بیرکردنـەوەی هەیـە، نـە جیابوونـەوەو دابـڕان، ئـەو بێدەنگییـە بێدنگییـەکی نائامادەیـەو هەمیشە دەکەوێتە ژێر هەژموونی دەسەلاّتی دەنگەوە.[٤٨]

---

[48]-بۆ زێتر شارەزایی بڕوانە:-جمالیات الصمت/هـ.س.پ/ل٢٦.

بەلاّم بێدەنگییەك هەیە، کە رووخسارە مەزنەکەی خۆی لە نێرگزییەتە کراوەکەیدا هەڵدەگرێتەوە، ئەو بێدەنگییە ئەگەرچی لە بەرامبەر دەنگ، کە کەشفکراوە، پێویستی بە کەشفکردن هەیە، بەلاّم هەمیشە دەبێتە شوێنی وڕووژان، ئەو بێدەنگییە بەردەوام پارێزگاری لە خودی خۆی دەکات، هەمیشە ئامادەیی خۆی بۆ گوتن هەیەو چاوەڕێی دەریچەیەك دەکات، ئەو بێدەنگییە جۆرێك لە ئاگاییمان پێدەبەخشێت، ئەگەرچی دەشێ نکۆڵی لە ئامادیی بێدەنگی بکرێت، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئاگاییەکە بە نێوماندا درێژ دەبێتەوەو خۆی زیاد لە روویەك (دەروونی، سیاسی، کۆمەلاّیەتی، تیۆلۆژی...هتد) دەنەخشێنێت.[49]

خوێنەری پێنجەم هەوڵدەدات خوێندنەوە بۆ ئەو جۆرە بێدەنگییە بکات، بە مانایەکی دیکە (دڵدار) لە دوتوێی ئەو بێدەنگییەوە دەیەوێت لە خودی خۆی رووت بێتەوە، ئەو بێدەنگییە لە دوتوێی خۆی نێودژییەکی داپۆشراوی هەڵگرتووە، ئەو نێودژییەی (دڵدار) ئەگەرچی خوێنەری پێنجەم بە کەشفکردنی هەڵدەسێت، بەلاّم لە سەر بنەمای لەیەکنزیکردنەوەی (زمان-لسا-ی دڵدارو کوردزمان) ئیرۆسیەتەکەی (دڵدار) بەرجەستە دەکات، بە مانایەکی دیکە

---

[49]-بڕوانە:-هـ.س.پ/ل١٦/١٧- هەروەها بۆ زێتر بەدواداچوون بڕوانە ل٢٧.

دەشێ ناسنامەی بێدەنگی (دڵدار) خۆی لەو (ئەلف و بایە)دا درێژ بکاتەوە، یان لەوێوە خۆی بۆ گوتنی دیکە ئامادە بکات.

کەواتە بێدەنگی (دڵدار) مانای کشانەوە لە ژیان نییە، بە قەد ئەوەی جۆرێکە لە بیانووگرتن بە ژیان و نکۆڵیکردن و دژبوونەوە، بە دیووەکەی دیکەش بێدەنگی (دڵدار) بێدەنگییەکی کراوەو ئەکتیفەو نکۆڵی لە هەمووان دەکات، هەموو ئەوانەش خوێنەری پێنجەم لە رێگەی سایکۆلۆژییەتی (دڵدار)و ((وەستان))ە شیعرییەکەیەوە کەشفیان دەکات، ئەو وەستانە شیعرییانەی کە نکۆڵی لە لێکخشانی وشەکان دەکەن، لە میانی تۆتۆلۆژییەتی وشەکانەوە وەدەستی دەهێنێت.

دەمەوێت لە رێگەی خەیاڵی خوێنەری پێنجەمەوە بڵێم: ((وەستان))ە شیعرییەکان و تۆتۆلۆژیای دەسەڵاتی وشەکانی (دڵدار) لەم سروودەدا هەوڵدەدا پێمانبڵێت:- ئەوەی کە دەگوترێت، گرنگ نییە، ئەوەی کە دەشێ بگوترێت و دەسەڵات بە هەموو ماناکانییەوە سانسۆری دەکات، ئەو گرنگە، هەر لەوێشەوە هیرارکییەتی بێدەنگی دەسەڵاتی رەهای دەنگ دەبڕێت و جیاوازییەکانی خۆی دادەمەزرێنێت، بڕینی دەنگ و بەرجەستەکردنی جیاوازییەکان جۆرێک لە ترس دەخاتەوە، دەشێ ئەو جۆرە لە ترس لە نێوان وەستانە شیعرییەکان و تۆتۆلۆژیای دەسەڵاتی دەنگەوە هەست پێبکەین.

خوێنەری پێنجەم، خوێنەرێکە بەردەوام دەیەوێت بێدەنگی ببڕێت، بەردەوام هەوڵدەدا نێودژییە داپۆشراوەکان کەشف بکات، تا زێتر هونەری کەشفکردن بنوێنێت، بەردەوام لەگەڵ ئەو

بێدەنگییە لە ڕێگەی پرسیارە جۆراو جۆرەکانی بەیەکدادەچێت و گفتوگۆکانی خۆی دادەمەزرێنێت، یان بە مانایەکی دیکە دڵەڕاوکێ ئەکتیفەکانی خۆی بەرەو خەیاڵ ڕابەرایەتی دەکات و لەوێشەوە لە جوانییە داپۆشراوەکان، یان جوانییەکانی بێدەنگی دەکۆڵێتەوە، بەڵام ئەگەر جوانی بێدەنگی وەك گوتمان هەوڵێك بێت بۆ بڕینی داخراوو ڕێگە پێنەدراوەکان، یان بە مانایەکی دیکە هەوڵێك بێت بۆ تەجاوزکردنی دەسەڵاتی چەسپاو، ئەوە خودی جوانی لێرەدا بە مانا (سارتەر)ییەکەی دەکەوێتەوە، کە دەبێتە نێودژییەکی داپۆشراو.[٥٠]

سەرەڕای ئەوەی پێناسەی (هیگل) مان بۆ جوانی بە دەستەوەیە، بەو مانایەی کە جوانی بۆ خۆی و لە خودی خۆیدایە.[٥١] بەڵام لە لایەکی دیکە بۆ قسە کردن لە جوانی پێویستە قسە لە مەعریفەی هەستی بکەین، لەوێشەوە بەرەو دوو بنەمای سەرەکی دەبینەوە یەکەمیان: جوانی بەرەو (وەرگر) دەبات و لە سەر چێژ دەوەستێت، یان بە مانایەکی دیکە بە وەزیفەی هونەری و وەزیفەی هونەریش لە دەستلێدانی

---

[50]-مجاهد عبدالمنعم مجاهد، علم الجمال في الفلسفة المعاصر، عالم الكتب- بيروت، ١٩٨٦، ط٣، ل٤٧.

[51]-هيغل- فكرة الجمال، ترجمة: جورج طرابيشي، دار الطليعة- بيروت،ط١.١٩٧٨،ل٨.

داهێنـەرەوە هەڵدەگرێتـەوە. بـەڵام دووەمیـان: بـەرەو دەمەتـەقێی جوانیمان دەبات.[52]

به گشتی خوێنەری پێنجەم چێژ له جوانی دەکات، بۆ ئەوەش دەکەوینـە بەرامبـەر دوو جـۆر لـە جـوانی، یەکـەمیان جـوانی وسـبەلێکراوەکان و نەسـتە کـە لەگـەڵ ئاگـایی خوێنـەر دێتـەوە، ئاگایی و هوشیاریی و بۆچوونی خوێنەر لەگەڵ ئەو جوانیەدا بە دەوری یەکترییـەوە دەخولێنـەوە، واتـە ئـەو جوانییـە بـە چـەمکی

[52] --د. مصدق الحبيب، حول جدلية المعيار الجمالي قي الفن و الادب: الحوار المتمدن، العدد ١٥٥٦-٢٠/٥/٢٠٠٦. له بارەی وەرگرەوە دەبێت قسه له چێژ وەرگرتن و میکانیزمیەتی وەرگرتن و کاریگەرییەکانی هەستی و وەڵامدانەوە بکەین، ئەوەش دەکەوێتە دوتوێی کۆمەڵێك بابەتی جۆراوجۆرەوە له بواری سایکۆلۆژی دەبێت باسی گۆڕانکارییەکانی ئاگایی و هەست و حاڵەتی درککردن بکەین، له بواری میتافیزیك پێویستە له شێوەو ناوەڕۆك بدوێین، له پەیوەندی جوانی و جۆرایەتی و باشی و حەقیقەت و واقیع بکۆڵینەوە. بەڵام له دەمەتەقێی جوانی بۆ نموونه (ئەفلاتون) بڕوای به جوانی ڕەها هەیە، بەڵام لای (هیگل) پێوانەیەکی میسالیانەی هەیە، بەو مانایەش جوانی ئەو شتەیە که تەواو و یەکگرتووەو به شێوەیەکی گشتی ئەویش دەچێتە بواری ڕۆحییەوە، ئەوەی هیگل لەوانی پێشووی خۆی جیا دەکاتەوە ئەوەیە که ئەو بەرزترین پلە به جوانی هونەری دەدات و پێیوایە جوانی هونەری سەرەتایە بۆ قۆناغی ڕوحانییەت. بەڵام باس و خواسی جوانی له قوتابخانەی فەرەنسی به سەر دوو بەش دابەش دەکرێت: ڕوونبینەکان ئەوانەی که پێیانوایە جوانی دیاردەیەکی بابەتئامێزەو هەر له سەرەتاوە درکی پێدەکرێت، سەرچاوەکەشی بۆ خودی ڕوح دەگەڕێننەوە، یان به مانایەکی دیکە بەهای جوانی به ماددەوە پەیوەست ناکەن. دووەمیان ڕاڤەکاران که پێیانوایە بۆ درککردنی جوانی ڕاڤەکردنی زانستی پێویستەو لێوردبوونەوە به سەرچاوەی بنەڕەتی چێژ وەرگرتن دەژمێرن.

ئاگایی و هوشیاریی خوێنەری داهێنەرەوە بەندە. دووەمیان ئەو جوانییەیە، کە بێدەنگی و سپێتی لاپەڕە دەیخاتەوە، ئەو جوانییە نێودڕژییەکی داپۆشراوە، یان بە مانایەکی دیکە ئەو جوانییە، جوانییەکی سیحرئامێزەو لە تێڕوانینی وردو خەیاڵدا دەبزوێ و دەگۆڕێ و بەرەو رووی بێدەنگی و هەبوونی بێدەنگیمان دەکاتەوە، کە جاویدانییە.

جوانی بێدەنگی یان داپۆشراو لەگەڵ خوێنەری خالق یەك دەگرێتەوە. لێرەدا خوێنەری پێنجەم لە لایەك خوێنەرێکی داهێنەرەو لە لایەکی دیکە دەشێ لە توێی هەوڵە نەبڕاوەکان و بەدواداچوونە قوڵەکانی بێدەنگی و سپێتی لاپەڕە، وەك خوێنەرێکی خالق خۆی بەرجەستە بکات*[53].

جیاوازی نێوان خوێنەری چوارەم و خوێنەری پێنجەم، جیاوازی دەسەڵاتی ونبووی (دڵدار)و بێدەنگی (دڵدار)ە، ونبوونی دەسەڵاتی (دڵدار) تەماهیبوون لەگەڵ ((کۆ)) بەرجەستە دەکات، بەڵام بێدەنگی (دڵدار) بەرەو جوانی پەتیمان دەکاتەوە.

خوێنەری چوارەم لە ونبوونی دەسەڵاتی (دڵدار)ەوە بەرەو خەیاڵ و بیرکردنەوەو کۆمەڵێك زانیاری وەسفی هەنگاو دەنێت، یان کۆمەڵێك خەیاڵ و زانیاری وەسفی وێنا دەکات و تێکەڵ بە

---

[53]- خوێنەری خالق لە ئیشکالیەتی چەمکی داهێنانەوە لە دایك دەبێت، ئەو خوێنەرەیە کە لە هیچەوە دەکەوێتە خەلق کردنەوە، بەڵام خوێنەری داهێنەر ئەو خوێنەرەیە کە لە سەر بنەمای ئەگەرچی رەگەزەکانیشی پێشتر هەبووبن کار دەکات، بڕوانە: عبدالحکیم محمود السید، الابداع و الشخصیە، دار المعارف/القاهرە،١٩٧١ ص٢١. .

نەفسی شەعبی، لەوێشەوە ڕەگەزە ئەفسانەئامێزەکان دەبێتەوە، لە ترۆپکی بەیەککگەیشتنی خەیاڵ و ئەفسانەشدا تەواو مەستی چێژو نەشوە دەبێت. بەڵام کاتێك لەو بەیەککگەیشتنە (بیر) دەکاتەوە، یان کە دواجار لەڕێگەی قوڵبوونەوەی ئەو ڕەگەزە ئەفسانەئامێزانەوە لە خەیاڵی خۆی دەترازێت، ئیتر بەرەو فۆلکلۆر دێتەوە، نەك بەو مانایەی کە فۆلکلۆر هەڵگری چێژو نەشوە نییە، بەڵکو بەو مانایەی کە فۆلکلۆر تەعبیری دەستەجەمعی و تەماهیبوون لەگەڵ ((کۆ))ی هەڵگرتووەو لە خەیاڵی تاکانە جیا دەبێتەوە.

دەمەوێت بڵێم، ئەگەر (ئەی ڕەقیب) لە مەسەلە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و ناسیونالیستییەکەیەوە جۆرێك لە نەشوەو خۆشی و چێژ بە جەستەی (خوێنەری کوردی) ببەخشێت، هەڵبەتە مەحاڵە خوێنەرێکی پەیوەست بە ئایین، یان (ناکوردی)و چەپگەرا ئەو جۆرە چێژو نەشوەیە بە دەست بهێنێت. یان بەمانایەکی دیکە هەمیشە لەگەڵی دژ دەکەوێتەوە، دیارە وەك گوتمان ئەو نەگەیشتنە، پەیوەندی بە گرژبوونەوەی خوێنەرە ناوبراوەکانەوە هەیە، ئەو گرژبوونەوەیە لە پەرچەکردارەوە رادەبێتەوە، بە دژی ئەو ئامانجەی کە (ئەی ڕەقیب) هەوڵی بۆ داوە. یان بە مانایەکی دیکە کاتێك، کە سروودی (ئەی ڕەقیب) جۆرێك لە خرۆشان بە جەستەی خوێنەری کوردی بە شێوەیەکی گشتی و خوێنەری ناسیونالیستی کوردی بە شێوەیەکی تایبەتی دەبەخشێت، لەوێوەیە کە خوێنەری ناوبراو هەمان کۆهەستی نەتەوایەتی هەڵگرتووە، بەڵام کاتێك ئەو خرۆشانە لە خوێنەرێکی دیکە بە

گرژبوونـــەوە كۆتـــايی دێـــت، ئـــيتر ئـــەو گرژبوونەوەيـــە، دەشـــێ بەشێكی پەيوەنـدی بـە هەسـتی جياوازييـەوە بكـات، وەك چـۆن دەشێ بەشێكی پەيوەندی بە قبوڵنەكردنی ئەويديكەوە هەبێت.

واتــە لێــرەدا جيــاوازی بــە مانايــەك لــە ماناكــان دەكەوێتــە بەرامبــەر هەســتی پــەرگيری‌و قبوڵنــەكردن، كــە دواجــار لــە بــری ئـــەوەی دەمەتـــەقێی فيكـــری‌و مـــەعريفی بەرهـــەم بهێنـــێ، دەمارگرژی‌و پەرگيری‌و كوشتن‌و بڕينی لێدەكەوێتەوە.

دەشـێ ئـەو هەسـتی جيـاوازيی‌و قبوڵنەكردنـە، لـە خوێنـەری يەكـــەم‌و دووەم‌و ســـێيەم تێپـــەڕێ‌و بـــە خوێنـــەری چـــوارەم‌و خوێنـــەری پێنجەمـــەوە پەيوەســـتمان بكـــات، واتـــە دەشـــێ لـــەو قبوڵنـــەكردن‌و جياوازييانـــەوە بگەينـــە خوێنـــەری چـــوارەم‌و پێنجەمەوە، ئەو دوو خوێنەرەی، كە تـەعبير لـە خـەياڵی جيـاوازو هەستی جيـاوازی‌و بێدەنگی (دڵدار)و سپێتی لاپـەڕە دەكـەن، لـە لايەكی ديكەش هەر لە دوتـوێی ئـەو خـەياڵ‌و وێنـاكردنی هەسـتە جياوازانــەوە، دەشـــێ چـــەندان خوێنـــەری ديكـــە خۆيـــان حەشـــار دابێت.

لـە نێـوان بێـدەنگی (دڵـدار)، يـان بـە مانايـەكی ديكـە نەسـتی (دڵدار) وەك تاك لە لايەك‌و هەستی خۆشی خوێنـەری ناسيونال‌و هەســـتی دژ بوونـــەوەی خوێنـــەرانی ديكـــە، ئەگەرچـــی مـــەرجی بەيەكـــەوە هـــەڵكردن، وەك مەســـەلەيەكی ئايـــديۆلۆژی‌و سياســـی ڕەنگـە مـەحاڵ بێـت، بـەڵام لـە ڕووەك لـە ڕووەكـان دەشـێ پرسـی ئيبداع‌و پرسی ئازادی بيروڕاو پرسـی خـەلقكردن، يـان بـە گشـتی پرسـی تاكانـەی هـەر يەكـەيان مـەرجێك ببێـت لـە مەرجـەكانی بـە يەكەوە هەڵكردن.

هەر لە سەر ئەو بنەمایە، خوێنەری پێنجەم دەڵێت: دەشێ پرسی تاکانەی (دڵدار) لە نێوان ئەو دوو جۆرە لە زمان، کە قسەمان لێکرد، پرسی بیدەنگی (دڵدار) بێت و پەیوەندی بە قۆناغی منداڵی و (لاڵەپەتی)ەوە هەبێت، بەڵام ئەو پرسە بە نیسبەت تەواوی خوێنەران (جگە لە خەیاڵی سیحرئامێزی خوێنەری چوارەم) پرسی جیابوونەوەو جیاواز بوونە، کە خوێنەری چوارەم و پێنجەم لە (ئەی رەقیب) وامانلێدەکات تا ئەو شوێنە درێژە بە خوێندنەوە بدەین، کە خوێنەرانی ناوبراو بیر لەو بەیەکگەیشتنە ناکەنەوە.

دیسان دەمەوێت بڵێم ئەوەی (ئەی رەقیب) بەرجەستە دەکات لە خرۆشانی هەستی نەتەوایەتییەوە دێتە بەرهەم، لەگەڵ هەموو ئەو ئیشکالانەی کە ئەمڕۆ دووچاری ئەو هەستە دەبێتەوە.

**واتە (ئەی رەقیب) ئەوەندەی خەمی (گەیاندن)ی تیا بەرجەستەیە، ئەوەندە بەرەو (شیعرییەت) هەنگاو نانێت. هەر لەو هەستەشەوە بۆ ئەویدیکەی جیاوازو (ناکوردی) هەستی گرژبوونەوە دنە دەدات، پەرچەکردار دەنێتەوە.**

لە دەرئەنجامدا ئەگەر زمانی رەمزئامێز پەیوەندی بە عەقڵ و لۆژیکەوە بکات و لەوێشەوە فیکر بخاتەوە، ئەوە زمانی هەڵچوونئامێز پەیوەندی بە (گرژبوون)و ((خاوبوونەوە)) دەکات و لەوێوە (نەشوە)و (دژبوونەوە)، یان بە مانایەکی دیکە هەستی خۆشی و هەستی ناخۆشی وازی دەکات. بەڵام وەك گوتمان زمانی (ئەی رەقیب) بە گشتی و بە هەر دوو دیووەکەی نیازئامێزەو بەشی زۆری دەکەوێتە تاك تەوەرییەوە.

بەمجۆرە لە (ئەی رەقیب)دا فیکری ئایدیۆلۆژیو سیاسی دەبێتە تاکە تەوەرەی دەسەلاتو دەبێتە تاکە مەبەستی دیاریکراو، هەر لەوێشەوە بە شێکی زۆری (ئەی رەقیب) دەکەوێتە دەرەوەی فیکری مەعریفیو ئەدەبییەوە، دەمەوێت بڵێم زمان لە میانی فیکری ئایدیۆلۆژیو سیاسیدا تەنیا گرنگی بە تاکە مەدلولێك دەداتو هۆشی خوێنەری پێ کۆنترۆڵ دەکات، ئەو کردارەش بە هەموو مانایەکەوە داماڵینی زمانە لە بەهای مەعریفیو رۆشنبیریو نەستیو ئیستێتیکیەکانو کوشتنی داله لە چوارچێوەی تاکە مەدلولێکی ئایدیۆلۆژیو سیاسییانەوە.

وەك دەزانین داهێنان بەبێ ئازادی، بە بێ فەزایەکی ئازاد، بە بێ ئازادکردنی خود بە هەموو مانایەکەوە مەحاڵ دەکەوێتەوە، هەر لەوێشەوە ئەرکی نووسەری داهێنەر ئازادکردنی پەیوەندییەکانی وشەو شتەکانو وشەو مانایە، تا بتوانێت لە دەرگاکانی خەیاڵی خوێنەر بە ژوور بکەوێت، وەك چۆن خوێنەریش هەر لەو ئازادییەوە دەتوانێ بەشداری خۆی لە کردەی داهێنانو خەڵقکردندا بنوێنێت، هەر لەو فەزا ئازادەوە دەتوانێت دەسەلاتی دەق لە ناوەوەو دەرەوە هەڵبوەشێننەوە. بەمەش دەق دەکەوێتە دەرەوەی زەمەنو مانا باوو دیاریکراوەکانەوەو ئازادیش لەو حاڵەتەدا دەتوانێت پرۆسیسەی کردارەکانی داهێنان بە ئەنجام بگەیەنێت، خوێنەریش لەوێوە وەك دەقێك لە دەرەوەی دەسەلاتەکانەوە دەتوانێت لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکدا خۆی نوێ بکاتەوە، یان لە دەقێکەوە بۆ چەندانی دیکە بگوازێتەوە.

شیعر كه پیشەسازی وشەیە لە بێدەنگی دەنگ دروست دەبێت، هەر لەوێشەوە ماڵی بوون دروست دەكات.

( هایدگەر )

زۆر نووستم، ئەوە ئێستا لە خەو رابووم.

( نیچە )

ئەگەر هێشتا زیندووی نیشانەی ئەوەیە كە هێشتا نەگەیشتوویتە ئەو جێگەیەی كە دەبوایە بیگەیتێ.

( پاولۆ كۆیلۆ )

# بەشی سێیەم

## باسی یەکەم

### ئەی رەقیب لە نێوان واقیعو خەیاڵدا

(ئەی رەقیب)[٥٤]

١-(ئەی رەقیب) هەر ماوە قەومی کورد زبان
٢-نای رمێنێ دانەیی تۆپی زەمان
٣-ئێمە رۆڵەی رەنگی سوورو شۆڕشین
٤-سەیری کەن خوێناوییە رابردوومان
٥-ئێمە رۆڵەی میدیاو کەیخوسرەوین
٦-دینمانە ئایینمانە نیشتیمان
٧-کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە
٨-زیندووە هیچ نانەوێ ئالآکەمان
٩-چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕرەشێر
١٠-بوون بە قوربانی هەموویان نێژران
١١-لاوی کورد ئێستاش حازرو ئامادەیە
١٢-جانفیدانە جانفیدانە جانفیدا
١٣-لاوی کورد هەڵسانە سەر پێ وەك دلێر
١٤-سا بە خوێن نەقشی بکا تاجی ژیان
١٥-کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە
١٦-زیندووە هیچ نانەوێ ئالآکەمان.

---

54. بڕوانە: عەبدولخالق علائەدین ، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، چ١/بغداد-١٩٨٥-.ل١٧٤.

(ئەی رەقیب) سروودێکە، کە ((دڵدار))ی شاعیری بە هەموو کوردستان ناساند، خودی ئەو (دەق)ە وەك گوتمان لە دوتوێی زمانە رەمزییەکەیدا تەعبیر لە بەسەرهاتی خوێناوی میللەتی کورد دەکات و شاعیر لە رووە دیارەکەیەوە لە بری میللەتێك دێتە گۆ رەسەنایەتی خەبات و کۆڵنەدان و سەرکەوتنەکانی کورد بە ناحەزان رادەگەیەنێت.

بەڵام لە بیرمان نەچێت کاتێك دەڵێم (ئەی رەقیب) دەقێکی شیعرییە بەو مانایە دێت، کە لەپاڵ زمانی رەمزی، هەڵگری زمانێکی هەڵچوونئامێزیشە، وەك چۆن لە پاڵ دەنگ و دەلالەتەوە، هەڵگری بێدەنگی و سپێتی لاپەڕەشە، هەر لەوێشەوە سەرەڕای ئیشکالەکانی (دڵدار/نەتەوە)و (ئەی رەقیب/فۆلکلۆر) دەشێ لە بێدەنگی و وسبەلێکراوەکانەوە، لە ونبوونی دەسەڵاتی (دڵدار)و سپێتی لاپەڕەوە، بە دوای جیاوازی و کرانەوەکانی (ئەی رەقیب)دا بچین و خوێندنەوەکانمان بونیاد بنێین.

کەواتە کاتێك وشەی دەق دەکەوێتە پێش سروودی (ئەی رەقیب) دەبێ دوو جۆر دەق لە بەرچاو بگرین، یەکێکیان دەقی ئیبداعییە، ئەویدیکە لەوێوە وشەی دەقی دەکەوێتە پێش، کە دوا شێوەی دیارو راستەوخۆی شتێکە، کە لێرەدا بە سروود ناونراوە. دیارە سروودی (ئەی رەقیب) زێتر بە رووە دیارەکەی دەکەوێتە پاڵ دووەمیانەوە نەك یەکەم.

ئەگەر چاوێك بە مێژووی کورد دابگێڕین (هەر چەندە مێژووی کوردی بە شێوەیەکی زانستی یەکلا نەکراوەتەوە) بەڵام دەبینین،

چەندان جار کەوتۆتە بەر هێرشی دڕندانەی دوژمن و ئەویش بە پێی توانای خۆی پارێزگاری لە بوونی کردووەو دژیان بۆتەوەو قوربانی داوە...هەروەها (وەك دەڵێن)*[55] خاوەن چەندان میرنشینی گەورە بووە، هەر لە میرنشینی ئەردەلانەوە تا دەگاتە میرنشینی بابان و بۆتان سەرەڕای ئەوەی لە سەر مافی رەوای خۆی کۆمەڵێك شۆڕشی دژی دوژمن ئەنجام داوە، بەلاّم بە هۆی شکستە یەك لە دوا یەکەکانەوە، کوردی بۆتە نێچیری ژێر دەستی دوژمن و بە هەموو مانایەکەوە داگیر کراوە...

بێگومان خودی ئەو شکست و داگیر کردنە گەورانە لە یادەوەری کوردی ونەستی کوردیدا بۆتە مایەی ترس و نیگەر[illegible]و هەست بە کەمی کردن، پاشان هەر خودی ئەو حاڵەتانە [illegible]ەرتاپای نەستی سیاسیشی تەنیووە، بۆیە دەبێ بۆ تێگەیشتن و لێخوردبوونەوەی سروودی (ئەی رەقیب) لە لایەك وەك مێژوو پەردە لە سەر ئەو شکستانە هەڵدەینەوە، لە لایەکی دیکە وەك سیاسەت بە دوای شۆڕشە ناکامەکاندا بچین.

چ[illegible]سروودی (ئەی رەقیب) وەك حاڵەتی (نووسەر-تاك)و وەك حاڵەتی (کۆمەڵایەتی-گەلی کورد) لە ناخی شکستەوە هاتۆتە بەرهەم، لە بەر هەندێ بە بڕوای من (دڵدار) بەردەوام هەوڵدەدات (شکستەکان) بە سەرکەوتنەکانی رابردوو پڕ بکاتەوە، یان بە شێوەی لاساییکردنەوەی سەرکەوتن،

---

[55]-دەستەواژەی "وەك دەڵێن" لەوێوە دێت کە بە شێوەیەکی بەڵگەئامێزو زانستی ئەو میرنشینانە دراسە نەکراوەن.

نوێنەرایەتی نەستی گوتارە شکستەکانی کوردی بکات، ئەوەش شـێوەیەکە، کـــە لـــەڕێی ئایـــدیۆلۆژیاوە، ئیســـتغلالکردن و بێنرخکردنـی کەلـەپوورو تـاکی نووسـەر لـە ئەسـتۆ دەگرێـت، دەمەوێت بڵێم بە بڕوای من بەشێکی دیکەی ئیشکالیەتی (ئەی ڕەقیـب) وەك شـیعر خـۆی لـەو ئیسـتغلالکردن و بێنرخکردنـەدا هەڵدەگرێتەوە، یان بە مانایەکی دیکە ئیشکالییەتی ناوبراو وەك نێودژییـەك بـە سـروودی (ئـەی ڕەقیـب) دا درێـژ دەبێتـەوە، هـەر بەهۆی ناودژییەکانەوەش خودی ئەو نوێنەرایەتیکردنەی (دڵـدار) وەك لـە زمـانی سـروودەکەدا دەردەکـەوێت، لـە لایـەك (توونـدو تیژی) پێوە دیارە لە لایەکی دیکە (هەڵچوون) یان بە مانایەکی دیکە لە ڕێگەی توونـدو تیژییـەوە فەزایـەك لـە هەڵچوون دێنێتـە بەرهـەم، لـە ڕێگـەی ئـەو فەزایەشـەوە هەوڵـدەدات راسـتەوخۆ هەسـتی کـوردی بـە سـەرکەوتنەکانی دوێنـێ بوروژێنێـت، بۆشاییەکانی ئێستای دەقی پێ پڕ دەکاتـەوە، بەڵام خودی ئەو پڕکردنەوەیـە ئەگـەر لـە سـاتەوەختی (مـەدی) نەتەوایـەتی و سـەردەمی (دڵـدار)، بشـێ وەك سیاسـەت و ئایـدیۆلۆژیا بـە سەرکەوتن بنووسرێت، ئەوە لە ئاستی داهێنـان و وەك کەلتوورو دەرکەوتە، هەڵبەتە کەمی دێنێت، وەك چۆن لە ئاستی ئەمڕۆی کوردی و گۆڕانکارییەکان جگە لە وەهم، جگە لە شەڕی کەلتوورو سیاسەت (مەبەستم لەسیاسـەتی حزبییـە) شـتێکی دیکـە بـە دەستەوە نادات، هەموو شەڕە خۆ بەخۆیەکانی کوردی لە ڕێگەی (ئەی ڕەقیب)ەوە ئەویدیکە کوردی وەك دوژمن تەماشا دەکات.

کەواتە کە دەڵێم لە ئاستی کوردی بەو مانایەی، کە هەتا ئێستاش کوردی کەمترین ئەزموونی لە شکستەکان بەدەست نەهێناوە، وەك چۆن لە سیاسەتدا کەمترین سوودی لە فیکرو کەلتووری رەسەنی کوردی نەبینیووە، (ئەگەرچی رەنگە لە سەر ئەو رستەیە بکەوینە نێو ئیشکالییەتی مێژووو ئیشکالییەتی رەسانایەتییەوە).

کەواتە (ئەی رەقیب) بە هەموو مانایەکەوە تەعبیر لە هاواری شکستەکانی کوردی دەکات بەرامبەر دوژمن، یان هاواری جەستەی لە خاچدراوی کورد وێنە دەکات، هەر چەندە ئەو هاوارە نابێتە مەیدانی بیرکردنەوەو بەرهەمهێنانی بەخۆداچوونەوەی کوردی، بەڵام دەکرێت بە پیتترین زەوی بێت، کە دەتوانێت لە رێی وپرۆژانی سۆزەوە قەناعەتی دڵ بۆ خۆی کێش بکات، کە لێرە خۆی لە وەهمی سەرکەوتندا دەنوێنێت.

بەمجۆرە باوەڕی کوردی لە رێی وپرۆژانی سۆزو هەڵچوونی دەروونییەوە لە دایك دەبێت نەك عەقڵ، ئەگەر بۆ مەرجەعی عەقڵی سیاسیشمان بگەڕێینەوە دەبینین لە سەر هەمان وپرۆژانی سۆز دێتە مەیدانو دەبێتە (ئەی رەقیب)ێکی دیکە، هەر لە سەر ئەو بنەمایە کوردایەتی کوردی لە دڵەوە قودسیەتێك بە (ئەی رەقیب) رەوا دەبینێتو بە دیووەکەی دیکەش بە چەشنی فۆلکلۆرو هەستی (رەسانەتی) خۆی تێدا دەدۆزێتەوە. یان بە مانایەکی دیکە (ئەی رەقیب) بەردەوام بۆ کوردی خرۆشانو وەهمی سەرکەوتنی پێیە، بۆیە هەموو دووبارە کردنەوەیەکی (ئەی رەقیب) لە رووی دەروونییەوە، بە مانایەکی دیکە لە رووی

دڵـەوە دووبـارە نوانـدنی چـالاکییە سیاسـییەکانو هەڵگیرسـانی مەشخەڵی سەرکەوتنەو چێژو نەشوەو خۆشی رەنگ دەکات.

لێرەدا دەبینین نەستی تێکشکاوی کوردی لە رێگەی (ئەی رەقیب)ەوە دەبێتە رەمزی کوردو کوردایەتی، بەڵام پێویستە بزانین کە دەستبردن بۆ ئەو رەمزەو کردنەوەی بە خوێندنەوەیەکی بەرهەمهێن هەرگیز نابێتە هۆی لەکەدار کردنی هەستی کوردی، بە قەد ئەوەی لێخوردبوونەوەیە لە دەقو پەردەهەڵدانەوەیە لە سەر نامەڵبەندێتی دەق لە دەرەوەی مەڵبەندەوە.

(دڵدار) لە بیستی شوباتی ١٩١٨ لە شارۆچکەی کۆیە لە دایکبووە هەر لەم ساڵەش عوسمانییەکان دەشکێنو ئینگلیز دەست بە سەر ئەو ناوچەیەدا دەگرن، بەهۆی قبوڵنەکردن حوکمی ئینگلیز یەکێك لەو بنەماڵانەی کە پەراگەندە دەبن بنەماڵەی (دڵدار)ە لە کۆیەوە بۆ رانیە، پاشان بۆ هەولێر[٥٦].

(دڵدار) لە تەمەنی چوار ساڵیدا بە نەخۆشییەکی زۆر گران ساڵێك دەکەوێتە نێو جێگا، کاتێك چاکیش دەبێتەوە (لاڵ) دەبێت، لە دواجار کە زمانی کراوەتەوە بە لاڵەپەتی قسە دەکاتو تا دوا ژیانی ئەو زمان گرانییەی هەر ماوە، کەچی پێش ئەو نەخۆشییە زۆر فەسیحو قسەزان بووە، دواجار خودی ئەو لاڵەپەتییە لای (دڵدار) دەبێتە هۆی ورووژانی حاڵەتێکی دەروونی،

---

[56]. بڕوانە: عەبدولخالق عەلائەدین، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد- هـ.س.پ.ل١٢/١٤.

چونكە نەیتوانیووە بە باشی بدوێت، ئیتر بۆ پارێزگاریكردن لە خودی خۆی هەمیشە كۆمەڵێك ئارەزووی تایبەتی خۆی پشتگوێ خستووە، ئەو حاڵەتەش لە قۆناغی كوللیەدا، وا لە (دڵدار) دەكات، كە وەك (مەسعود محەمەد) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: بە تەواوی هیچ كاتێك كەموكورییەكانی خۆی بە كەس نەگوتووە هەمیشە خۆی زەبت كردووە،[٥٧] لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەو زەبتكردنە لای (دڵدار) دەشێ وەك حاڵەتە دەروونییەكە بە چەپاندن لە (بەرزە منەوە-انا اعلی)) بۆ (من -انا) تەماشا بكەین، لەبەر هەندێ (من)ی (دڵدار) بۆ راگرتنی (بەرزە من) هەمیشە رەفزی ئارەزووەكانی خۆی دەكات، تا لەگەڵ (بەرزە من)دا نەكەوێتە ململانێ.

بەمجۆرە بەرە بەرە چەپاندنی بەردەوام هێزێكی گەورەی (من)ی (دڵدار) خەسار دەكات، دەشێ قسەكردنی (دڵدار) بە شێوەی ((كۆ)) تەماهیبوونی بە (نەتەوە) بەڵگەیەكی لاواز نەبێت، ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ، كە (من)ی (دڵدار) تووشی لاوازی دەبێتو هەر وەك چۆن لە زۆر هەڵوێستی ترسناكدا تووشی

---

57. - هەروەها دەڵێت:-دڵدار پەردەیەكی تەمومژی بە دەورەوە بوو نەیدەهێشت هێندەی مرۆڤی ئاسایی بۆ بینەر ئاشكراو و خۆش خوێن بێ. چەندێكی لەگەڵدا ژیابێتم و وتوێژم لەگەڵدا كردبێت و لە یەكدی نزیك كەوتبینەوە زانیوەتم ئەمەی دەیبیسنم و دەیبیتم هەموو (دڵدار) نییە: پشكێكی حەقیقەتی لێوە دەردەكەوت كە هەرگیز بایی لێشارەزابوونی تەواوی نەدەكرد. هـ.س.پ/ بۆ زێتر بەدواداچوون دەقی نووسراوەكەی مامۆستا مەسعود محەمەد لە لاپەڕە ٦٢-٧٢ ، هـ.س.پ. بخوێنەوە.

راکردن بووه، یان بەهۆی تەحوکمکردنەوە هەوڵیداوە پارێزگاری لەخۆی بکات، بۆیە دەبینین لە هەموو ژیاندا ویستوویەتی بە (نەکراوە)یی بمێنێتەوە. هەروەها لە هەندێك باریشدا دووچاری هەڵچوونی دەروونی هاتووەو بە توندی هێرشی بردووە، ئەو هێرشبردنەش لە پەرچەکردارەکانی بەرامبەر بە ئەویدیکەی جیاواز، بەرامبەر بە خوا بە ئایین (ناپرمێنێ دانەیی/دانەری-دینمانە ئاینمان) زۆر بەجوانی بەرجەستە دەبێت.

لە هەردوو باریشدا (من)ی (دڵدار) هێزێکی گەورەی خۆی لە بار بردووە، خودی ئەو لە باربردنەش بۆتە هۆی ئەوەی کە (من)ی (دڵدار) زێتر بەرەو لاوازی بچێ و هەر بە هۆی ئەو لاوازیەشەوە دواجار دووچاری دڵەراوکێی (القلق) ببێت.

بەمجۆرە هەموو گیرانێکی زمان لەلای (دڵدار) حاڵەتە گەورەکەی (لاڵ)ی بە بیر هێناوەتەوە خودی ئەو (لاڵەپەتی)یەش بۆتە ترسێکی هەمیشەیی و بەبالآی (دڵدار)دا بڕاوە.

سەرەتا پرۆسەی نووسین لە سروودی (ئەی رەقیب) بە دەنگی (ئە) لە وشەی (ئەی) دەستپێدەکات، تا لە دوتوێی ((کۆ))دا (من)ی لاوازی خۆی بخاتە چوارچێوەکەوە، یان بە هۆی ئەو تەماهیبوونە وجودێك بە (من)ی ونبووی خۆی ببەخشێت، هەروەها ویستوویەتی لە مەڵبەندێتی دەقدا بە (کۆمەڵێك) نیشانە، سەرکەوتنی کوردی، کە لە دەرەوەی مەڵبەندێتی دەق دەکاتە سەرکەوتنی (زمان-لسان)ی (دڵدار)یش پێناسە بکات، کە بێگومان لە ناوەوە هەم دەلالەت لە بێهێزی کوردی و هەم بێهێزی (دڵدار) دەکات.

گوتمان (دڵدار)، ئەگەری مانەوەی سەلامەتی زمانی خۆی بە ئەگەری مانەوەی قەومی کورد دەبەستێتەوە، بۆ دڵنیابوونیش لە دێری (٢)دا بە دەستەواژەی (نایرمێنێ)[58] مانەوەکە تۆکمەتر نیشان دەدات. کەواتە ئەگەر لە مەڵبەندێتی دەق دەستەواژەی ناوبراو، مانەوەی کوردی بێت، ئەوە لەو دیو مەڵبەندی دەق بێ دوودڵی تەئکید لە سەر مانەوەی زمانی خۆی دەکات، بۆ ئەوەش رابردووی دوور (میرنشین-منداڵی) دەکاتە نیشانە، جا ئەگەر جەستەی کوردی بە (تۆپی زەمان) نەرمێت[59] ئەوە هاوتەباکەشی کە زمانی (دڵدار)ە بە هیچ نەخۆشییەکی کوشندە لە ناو ناچێت.

وەك بەدیار کەوت لە تەواوی سروودی (ئەی رەقیب)، رابردوو، بە هەردوو ماناکەی (کورد/دڵدار) دەرکەوتنێکی گەورە بە خۆوە دەبینێت و نیشانەیەك لە دوتوێی خۆیدا مەیسەر دەکات، خودی ئەو نیشانەیەش خۆی تەنها لە مەدلولی سەرکەوتنی (کورد/دڵدار) دەبینێتەوە، یان حەقیقەتێك لە خۆیدا بەرجەستە دەکات، خودی ئەو حەقیقەتەش تاکە مانایەك

---

[58]. بڕوانە ئەی رەقیب.

[59]-(دەبێ خوێنەر بزانێت، کە (دانەیی تۆپی زەمان) (دانەری تۆپی زەمان) هەردووکیان بەکار دێت، بەڵام لەو سەرچاوەیەی کە من پشتم پێبەستووە بە (دانەیی تۆپی زەمان) هاتووە، هەر چەندە بەلای من هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، ئەگەرچی حاڵەتی دووەم لە بیروباوەڕ (دڵدار)و مەبەستی سروودەکە نزیکترە، چونکە (دانەری تۆپی زەمان) وەك ئاماژە کردن بە خوا (دینمانە-ئایینمانە نیشتیمان) پشتراستتر دەکاتەوە، بە پێچەوانەشەوە هەر راستە).

دەبەخشێت، یان بە مانایەکی دیکە هەموو هێزی خۆی لە تاکە مانایەکدا کورت دەکاتەوە، بەوەش شاعیر دەیەوێت بالادەستییەك لە دەرەوەی گومانەوە بە (کورد/دڵدار) بدات، بۆیە هەمان مەبەستو ئاماژەکانی دوێنێ بۆ ئێستا دەخوازێتو ئێستای پێ روون دەکاتەوە، یان بە جۆرێکی دیکە (ئێستا)ی پێ سیخناخ دەکاتو هەوڵدەدات بە هەمان حەقیقەتی دوێنێ، کۆنترۆڵی ئەمڕۆ بکات.

بەمجۆرەش رابردوو وەك کارکەرێکی چالاكو بە توانا دەبزوێ، ئالای رەسانایەتی (کورد/دڵدار) بەرز دەکاتەوە، لە خودی ئەو ئامادەباشییەی (رابردوو) شاعیر هەوڵدەدات هەستی کوردی بوروژێنێت، وەك چۆن بەدیووەکەی دیکە دەیەوێت وسبەلێکراوەکانی نەستی خۆی بەرجەستە بکات، هەر ئەوەشە وا لە (دڵدار) دەکات، راستەوخۆ لە دوێنێ ئاگادارمان بکاتەوەو لە دایکبوونی (کوردی) بە هۆی (بەگری/شۆڕش)و (فەسیحی زمانی خۆی) بە هۆی (ئەی رەقیب)ەوە رابگەیەنێت- بڕوانە دێری (٣-٤)[60] بەو واتایەش دەیسەلمێنێ کە خودی ئەو شۆڕشە، ئەگەر لە لایەك شۆڕشی لە دایکبوونی کوردی بێتو رەنگی (سوور) گەواهی لە دایکبوونی بێت، لە لایەکی دیکە شۆڕشی لەدایکبوونی زمان فەسیحی (دڵدار)ەو، سروودی (ئەی رەقیب) گەواهی مانەوەی زمانە فەسیحەکەی پێیە.

60. بڕوانە ئەی رەقیب/هـ.س.پ.

بـــەمجۆرە (كـــوردی/دڵـــدار) ژیـــان بـــەخۆ رەوا دەبیـــنن، بـــە ئسپاتكردنی تەواوی ئەو ژیانەو پەرەپێدانەكانی دەكرێت ئامـاژە بـە دێـری (٥) بـدەین، كـە لەوێـدا راسـتەوخۆ بـۆ ئیپراتۆریـەتی (میـدی) دەگەڕێتـەوە، كـە وەك دەڵێن بـە كـۆنترین ئیمپراتۆییـەتی كوردان دەدرێتـە قەڵـەم. هـەر لـە سـەدەی هەشتەمەوە تـا سـەدەی نۆیەم پێش زایین فەرمانڕەوایی وڵاتیان بە دەستەوە بووە. رەنگـە لـە لایـەكی دیكـە ئـەو ئاماژەكردنـە لـە نـاوەوەی شـاعیرو دەرەوەی مەڵبەندێتی دەق ئاماژە بێت بە زمان فەسیحی و قسـەزانی خـودی (دڵدار) بەر لە تووشبوونی بە نەخۆشییەكەیەوە.

كەواتـە لـە حاڵـەتی پرۆسـەی نووسـین (كـە ئێمـە پێمانووایـە حاڵـەتێكی ناسرووشتییەو بەشێكی زۆری نائاگـایی كـاری تێـدا دەكات) كاتێك (دڵدار) لەو پرۆسەیە بە نائاگاییدا شۆڕ دەبێتەوە، دووچـاری جۆرێـك لـە شكسـت و تـرس دەبێـت، بـۆ بەزانـدنی ئـەو شكسـت و ترسـەش وێنەیـەك هەڵدەبـژێرێت (كـە لێـرەدا رەمـزی كوردی و وێنـەی كوردییـە) تـاكو وەك ئەلتـەرناتیڤ لـە بـری مـنی لاوازی خـۆی بـە كـاری بهێنێـت. دەمەوێـت بڵـێم هـەموو بـە بـیر هێنانەوەیـەكی نەخۆشـییەكە دەبێـتە هـۆی وروژانـی ترسـێك، بـۆ لابردنی ئەو ترسەش هەمیشە پەنا بۆ رەمزو وێنەیەك دەبات، كـە ترسەكەی پێبرەوێنێتەوە.

لێرەدا ئەگەر راستەوخۆ بـۆ دێـری(٧-٨) بگەڕێینـەوە دەبیـنین لە سروودەكەدا جۆرێك لە نیگەرانی و دوودڵی هەیە، بە مانایـەكی

دیکە زۆر عەفەوییانە دەمانخاتە نێو پرسیاری (مان–نەمان).[61] بە جۆرێکی دیکە دەکرێ بڵێین بە هۆی حاڵەتە دەروونییەکەیەوە هەمان واتای دێری (١–٢) دووبارە دەکاتەوە، بەلاّم ئەگەر لە دێری (١) بە وشەی (هەرماوە) تەئکیدێکی تەواو لە بوونی کوردی بکات، ئەوە لە دێری (٧) ئەو تەئکید کردنە بە باشی خۆی ناخاتە روو، یان لاواز دەکەوێتەوە، ئەو لاوازییە بەشێکی زۆری بە نائاگاییو نەستی (دڵدار)ەوە دەلکێ، دەمەوێت بڵێم شاعیر بە شێوەیەکی لاواز هەوڵی نەفیکردنی (مردن) دەدات، بیهێزی کیانی کوردیو کیانی زمانی (دڵدار) لە دێری (٧) لەوەدایە کە شاعیر نایەت راستەوخۆ بە یەك لەرەو ریتم، و بە بێ دوودڵی دان بە زمانی (خۆی)و بە (کیانی) کوردی بنێت، وەك چۆن لە دێری (١)دا زۆر بە ئاگاییانەوە دەیخاتە روو، بەڵکو هەوڵدەدات لە میانی پەیوەندی نێوان دەستەواژەو وشەکانی (زیندووە–مردووە، نانەوێ... هتد)و هەروەها لێکنزیکبوونەوەی دەلالەتە هاوواتاکانەوە وشەی دژ بە مەبەست دەرپەڕێنێتە دەرەوەی بوونی (زمان)و بوونی (کوردی)یەوە، وشەی دژ بە مەبەستیش هەڵبەتە وشەی (مردن)ە، یان بە مانایەکی دیکە هەوڵدەدات لە رێگەی هێرشی توونددو تیژی وشەو دەستەواژەکانی نارمێ، زیندووە، زیندووە، نانەوێ .. هتد، ماناو دەلالەتەکانی وشەی (مردن) کاڵ بکاتەوە، بڕوانە دێری (٧–٨).

---

61. بڕوانە ئەی رەقیب/ هـ.س.پ.

بـەڵام دەپرسـین کـام دەرەوە، دەرەوەی کیـانی کـوردی، یـان دەرەوەی زمان-لسان-ی دڵدار؟

هەڵبەتـە ئـەو پرسـیارەش لـەوێوە دێـت کـە وشـەی (مـردن) وشـەیەکە بـەردەوام پرسـیار دەوروژێنێـت، هـەروەها وروژانـدنی پرسـیار لـە وشـەی مردنـدا تـەنها بـە رابـردووەوە بەنـد نییـە. بـە مانایـەکی دیکـە پرسـیاری وشـەی مـردن پرسـیارێکی ئەبـەدیو ئەزەلییـە، لـە زەمـەنو کـاتێکی دیـاریکراو گـیر نـاخوات، کەواتـە لێـرەدا پرسیاری مـردن پرسیارێکی ئێستاییە، بۆ رابـردوو هـیچ جێکەوتەیەکی نابێت، ئەگەر لەو رووەوە تەماشای بوونی کوردی بکەین دەبینین بە قەد ئەوەی بوونی بە ساتەوەختی دەرکەوتنی ئێسـتای (ئـەی رەقیـب)ەوە بەنـدە، ئەوەنـدە بـە رابـردووەوە بەنـد نییــە، یــان بــە جێکەوتــە مێژووییەکانــەوە نالکــێ، وەك چــۆن دەتوانین بڵێین (ئەی رەقیب) بە قـەد ئـەوەی هـەڵگری زینـدووێتی زمـانی-لسـان- (دڵـدار)ە، بـەو مانایـەی کـە لەگـەڵ (زمـان-لسـان) باوی نەتـەوەو کۆمـەڵ تـەماهی خـۆی دەنوێنـێ، ئەوەنـدە هـەڵگری زینــدووێتی ئــاڵای کــوردی نییــە، هەڵبەتــە لەگــەڵ ئەویدیکــەی نـاکوردیش جیـا دەکەوێتـەوە، مەبەستمە بڵـێم ئەگـەر تێـڕوانینی (دڵدار) تێڕوانینی باوی ((کۆ))بێـت، ئـەوە تێـڕوانینی کوردی بـۆ ناســــیونالیزم تێڕوانینێکــــی گشــــتگیرەو نــــەیتوانیووە تایبەتمەندییەکانی کوردی لەخۆ بگرێت.

ئــەو خاڵــە نــاوبراوەش دەشــێ وەك خــاڵێکی ســەرەکی لــە جیاکردنـەوەی خوێنـەری یەکـەمو چـوارەم/پێنجـەم بـە فریامـان بگات.

بۆیە شاعیر هەوڵدەدات بە دێری (١١،١٢)و بە ئامادەباشی (گیانبەخشینی لاوانی کورد)و (زمانی-ئەی رەقیب) بەرپەرچی تێروانینی گشتگیرو پرسیاری مردن بداتەوە، وەك چۆن بەرهەمهێنانی (ئەی رەقیب)و بە رەنگی سووریش درێژە بە ئامادەباشییەکان دەدات، بەڵام بێگومان هیچ یەك لەوانە ناتوانن جیاوازییەکانو درێژبوونەوەی جیاوازییەکان، بۆ ئەمڕۆ خەفە بکەن.

کەواتە لەگەڵ جیاوازییەکاندا تا دێت پرسیارەکان چڕتر دەبنو دواجار بە ناچاری (دڵدار) لە دێری (١٣،١٤) ئەرکەکە دەخاتە سەر شانی خۆی (نەك وەك تاك، بەڵکو وەك لاو/لاوی کورد) تاکو لەوێدا درێژە بە هەمان خوێنو قەبارەو توانای رابردووی (زمان-لسان)و (کیانی کوردی) بداتەوەو پانتاییەکانی ئێستای ژیانی پێبڕازێنێتەوە.

گوتمان لە دێری (١١،١٢) ئامادەباشی لە گیانبەخشیندا هەیە، لە دێری (١٣،١٤) هەڵدەسێت تا وەك دێری (٣،٤) مەیدان بڕازێنێتەوە. بەڵام پرسیاری ئێمە ئەوەیە ئایا هەڵسان لە میانی وشەی نووسراو دەتوانێت بێتە مەیدانی خۆ نمایشکردن؟ دەتوانێت سنووری زمان - (دەق) ببەزێنێت بە کردە پرۆسیسەی (بوون) بکات، تا بۆ دواجار مردن رەتبکاتەوە؟ یان ئایا ئەو پرسیارە بە نەکراوەیی دەمێنێتەوەو بە دەوری خۆیدا خولدەخوات؟

ئایا ئەو ئامادەباشیو هەڵسانە لە تویێی وشەی نووسراودا تا ئەو سنوورە دەڕوات کە بە خوێن-بە ئەی رەقیب، تاجی ژیانو

تـاجی جیاوازییـەکان بنەخشـێنێت، یـان هـەر وەك خـەونی پەڕگیرانەی شاعیر دەمێنێتەوە؟

هـەموو ئـەو پرسـیارانەی ئێمـە پەیوەنـدی بـە نامەڵبەنـدێتی دەقـەوە دەکـەن و لەوێشـەوە هەوڵـدەدەن بـۆ نەسـتی شـاعیر بگەڕێینـەوەو ببپرسین ئایا بە وشـەی نووسراوی مەبەستدارەوە شاعیر دەتوانێت (لاڵەپەتەیی) خۆی بسڕێتەوە، یان لـە نەبوونی کیانی کوردییـەوە ئالآی کوردی بـەرز بکاتـەوە؟ لە لایـەکی دیکـە شـاعیر چـۆن بـە پـەرگیری ناسیونالیستانە دەتـوانێ فەزایـەك بـۆ قبـولکردنی ئەویدیکـە برەخسـێنێت، پانتاییـەك بـۆ خـەیاڵ و بیرکردنەوەی ئەویدیکە بسازێنێت؟

کەواتـە هـەر لـەو بنەڕەتـدا نیگەرانیـە گەورەکـە لـە مەڵبەنـدو نامەڵبەنـدی دەق بـە هـۆی پرسـیاری (مـردن- لاڵەپەتـەیی)و (جیـاوازی-پـەڕگیری)و (قبـوڵکردن)و (قبوڵنـەکردن)ەوە دروسـت دەبێت و هـەر لەوێشـەوە رەهەنـدی جەسـتەی (دڵـدار)و رەهەنـدی (کیانی کوردی) دووچاری جۆرێك لە ونبوون و وێڵبوون دەکات.

هـەروەها ئەگـەر زێـتر جـەخت بکـەین و جەسـتەی کـوردی زێـتر روون بکەینـەوە دەکرێـت بپرسـین ئایـا لـە سـاتەوەختی ئێسـتای سـروودی ئـەی رەقیـب، خـاوەن ئـالآین و ئالآکـەشمان نانـەوێت، خاوەن کیانین و کیانەکەشمان نارمێت؟!.

هەڵبەتە ئەو پرسیارە بە نیسبەت خـودی شـاعیرەوە بە هـۆی تـەماهی بـوون لەگـەڵ ((کـۆ))ئەگـەر بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان لـە نووسیندا هێز بنوێنێت، ئەو هێزە لە سـروودی (ئـەی رەقیـب)ەوە حەقیقـەتێك بـە (دڵـدار) ببەخشـێت، وەك لـەم نووسـینەدا دیـارە

بەبڕوای من ئەو حەقیقەتە لە مەسەلە ئیبداعیەکەوە سەرچاوە ناگرێت، وەك چۆن پەیوەندی بە مەسەلەکانی ئازادییەوە نییە، بە قەد ئەوەی پەیوەندی بەوماناو مەبەستو دەلالەتە پەرگیرانە دایە، کە کوردی وەك نەتەوەو کۆمەڵگە وەك ((کۆ))خستوویەتە پاڵ سروودەکەوە.

کەواتە ئەو حەقیقەتە، حەقیقەتی ئیبداعی نییە، بەڵکو لە دەسەلأتی ((کۆ))هەڵدەقوڵێ و لەوێشەوە نەشئەیەك بە دەسەلأتی جەستەی ونبووی (دڵدار) دەبەخشێت، دەشێ بڵێین تا رادەیەکی زۆر ئەو نەشئەیە بوونی (دڵدار)ی لە نەبوونەوە تا ئێستای (ئەی رەقیب) درێژ کردۆتەوە، دەمەوێت بڵێم تەماهیبوونی (دڵدار) لەگەڵ ((کۆ)) لە جەستەی (ئەی رەقیب) لەلایەك نەبوونی دەسەلأتی تاکانەی (دڵدار) دەسەلمێنێت، لە لایەکی دیکە دەشێ بێدەنگی (دڵدار) لە جەستەی (ئەی رەقیب) تەعبیر لە جوانی (دڵدار)و وسبەلێکراوەکانی نێو زمانی هەڵچوونئامێزی (ئەی رەقیب) بکات.

بەلأم ئەو مەسەلەیە بە نیسبەت بوونی (کوردی) رەنگە دووچاری ئیشکالمان بکاتەوە، ئیشکالەکەش ئەوەیە چۆن دەتوانین بە هەمان ئامارژەو نیشانەی سەردەمی میرنشینەکان نەشئە بە جەستەی کوردی بدەینو بڕیاری بەیانی لە سەر بنەخشێینین.

کەواتە دەسەلأتی سروود لە ساتەوەختی ئێستادا جگە لە یۆتۆپیا شتێکی دیکە نییە، خودی ئەو یۆتۆپیایەش تەنها جەستەی ونبووی ((دڵدار)) تیایە بالأ دەستە، جەستەی ونبووی

(دڵدار)یش بە کەشفکردنی خوێنەری چوارەم بە شێوەیەکی کاتی و خوێنەری پێنجەم بە شێوەیەکی بەردەوامەوە بەندە[٦٢].

بەلاّم بۆ کوردی ئەو مەسەلەیە تا رادەیەکی زۆر یۆتۆپیایەکی روخێنەرە، هەر لە سەر ئەو بنەمایەش دەڵێین (ئەی رەقیب) بۆ ئێستای کوردی جگە لە مەستبوونێکی سیاسیانەی نەتەوەپەرست-فۆلکلۆریانەی ئەفسانەئامێز[٦٣]، نەبێت شتێکی دیکە نییە.

لە لایەکی دیکە ئەگەر سەیر بکەین دەبینین لە سروودی (ئەی رەقیب) داهاتووی کوردی بە هەموو مانایەکەوە ونەو ئاسۆ لێڵە، دەشێ بەشێکی ئەو دیار نەبوونە بۆ خودی بێدەنگی سپێتی لاپەرە بگەڕێتەوە، بەلاّم بەشێکی بە کوردی و کردەی ئیبداعی کوردییەوە بەندە، بەو مانایەش ئەو ئامادەباشییەی کە شاعیر ئاماژەی بۆ دەکات دەبێتە ئامادەباشییەکی وەهمی، چونکە کردەی لەگەڵدا نییە، یان بە مانایەکی دیکە سەرچاوەکەی لە دڵەوەیە نەك عەقڵ (وەك روونمانکردەوە)، بۆیە سروودی (ئەی رەقیب) بە هۆی وروژانی هەست و سۆزەوە توانیوویەتی هەڵچوونی کوردی وەك ((کۆ))لە خۆ بگرێت، بەلاّم لە بیرمان

---

62- شێوەی کاتی خوێنەری چوارەم بە لێکترازانی خەیاڵ و ئەفسانەوە دەلکێت. بەردەوامبوونی خوێنەری پێنجەمیش لە بێدەنگی و هەبوونی بێدەنگیدایە، کە جاویدانییە.

63-ئەفسانە بە مانا بەرفرەوانەکەیەوە دەکەوێتە چوارچێوەی فۆلکلۆرەوە- بڕوانە: الادب الشعبي و العادات و التقاليد الشعبية/ ه.س.ث. ل٣.

نەچێت هەمیشە هەڵچوونی سۆزی دەروونی لە بەرامبەر عەقڵ سەرەڕۆیانەو بێ بنەما دەکەوێتەوە.

هەروەها لە لایەکی دیکە بەشێك لە دیارنەبوونی داهاتوو، لە نامەڵبەندێتی دەقدا بۆ خودی (دڵدار) دەگەڕێتەوە، واتە بە (من)ی وێڵبووی (دڵدار)ەوە پەیوەستەو دەکەوێتە ژێر هەژموونی (بەرزە من)ەوە، هەر لەوێشەوە جۆرێك لە نەگوتن و چەپاندن دروست دەبێت، هەر لەو چەپاندن و نەگوتنەوە (دڵدار) دووچاری نیگەرانی دەبێت، بە دیووەکەی دیکەش دەشێ نیگەرانی (دڵدار) پەیوەندی بە توانەوەی (دڵدار) لە نێو مانا پەرگیرەکانی ((کۆ))و بە ونبوونی دەسەڵاتەوە هەبێت، خودی ئەو نیگەرانییەش وای لێکردووە کە هەرگیز بە روونی داهاتوو نەبینێت، یان بە مانایەکی دیکە کە لە غیابی خوێنەری پێنجەم کە ئێمە وا ناوزەدمان کرد، هەمیشە خۆی بخواتەوە، یان بە هەڵچوونەوە لە میانی نووسیندا پارێزگاری لە وسبەلێکراوەکانی خۆی و سپێتی لاپەڕەو جوانی بێدەنگی بکات.

سەرەڕای ئەوەش دووبارەکردنەوەی دێری (٧،٨) لە کۆتای سروودەکە بە شێوەیەکی روونتر دوودڵی و نیگەرانی (دڵدار) لە لایەك و نیگەرانی بوونی کوردی لە لایەکی دیکە دەچەسپێنێ، هەر لەو دەرئەنجامەش دەشێ بڵێین تاکو ئێستا نەستی سیاسی کوردی لەو نیگەرانییە رزگاری نەبووە، وەك دەشزانین ئەو نیگەرانییە ناکەوێتە دوتوێی نیگەرانی ئیبداعییەوە، بە قەد ئەوەی ترسە لە رەشبوونەوەی (من)ی کوردی، بە دیووەکەی دیکە لای (دڵدار) ترسە لە لەدەستدانی بەهرەی نووسین، هەر

لەوێشەوە هەستی کوردی بوونی خۆی بە وەهمی (ئەی رەقیب) بە زیندووی رادەگرێت، وەك چۆن بە شێوەو رەنگی جیا جیاش خودی ئەو وەهمە دابەش دەکات، وەك گوتمان هەموو ئەو شێوە جیا جیایانەش لە سەر وروژانی سۆزی دەروونی کوردی کار دەکات، ئەگەرچی بە هیچ جۆرێك ئەو وروژانە نابێتە بنەمایەك بۆ عەقڵی کوردیو عەقڵی سیاسی کوردی، بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت لە میانی سۆزەوە خۆی بە جیهان بناسێنێت، بەڵام وەك بۆمان دەرکەوت خوێنەری پێنجەم بۆ (دڵدار) بنەمایەك بۆ خوێندنەوەیەکی دیکەی جیاواز دەخاتەوە.

****

## باسی دووەم

### ئەی رەقیب لە نێوان دەنگو دەنگدانەوە

دەشێ بە شێوەیەك لە شێوەکان بڵێین تەواوی گوزارەکانی سروودی (ئەی رەقیب) لە هەستی ناسیونالیدا خۆی دەنوێنێ و لەوێشەوە خوێنەری یەکەمتان بە بیر دەخەمەوە، هەروەها ئێمە لەو خوێندنەوەیەدا ئەو هەستە لە گوزارەی (کورد–میدیا–کەیخوسرەوو ئالاَ–زمان=هەستی ناسیونالی)و (جوانی–سپێتی لاپەڕە=نەست) بەرجەستە دەکەین، یان بە مانایەکی دیکە جەخت لەسەر دەنگو دەرئەنجامی دەنگیش لە توێی دەنگدانەوەدا دەگرین، لەوێشەوە پەنجە دەخەینە سەر بێدەنگی و بەیەکەوە لکانی (دەنگ/نەتەوە)و (دەنگدانەوە/زمان)و (بێدەنگی/جوانی) لەتوێی گوزارەو بڕگەکانەوە بە (ئالاَ)وە پەیوەستیان دەکەین و لە (بێدەنگی/جوانی)یشەوە ئاماژەکانمان بۆ خوێنەری پێنجەم دەگوازینەوە.

لە سەرەتا بەر لەوەی بچمە نێو ئەو خوێندنەوەیەوە، دەمەوێت بە خوێنەران رابگەیەنم، کە هەوڵدەدەم لەم بەدواداچوونەمدا، ئەو خاڵانەی خوارەوە روون بکەمەوە:

یەکەم:– هەوڵدەدەم جەستەی (ئەی رەقیب) بە (دەنگو دەنگدانەوە) پەیوەست بکەم، لەوێشەوە (دەنگ) بەرەو (نەتەوە/کەیخوسرەو) ببەم، (نیشتیمان/میدیا) بە (جوگرافیا/کوردستان) یەکسان بکەم.

بەڵام دەنگدانەوە بە (زمان/ریتم)و (هەستی ناسیونالی/رۆحی نەتــەوە) پەیوەســـت دەکــەم، لەوێشــەوە بــە (ئــالآ/بــەرگری) دەیبەستمەوە.

دووەم:- دەمەوێت لە خودی (دڵدار) ی شاعیریشەوە وەك تاك، چەمکی (بێدەنگی) لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی خوێنەر بەرەو (سپێتی/بۆشایی) (چەپێنراو/نەست) بکەمەوە، دواجار لە (جوانی/ئالآ) دا بەرجەستەیان بکەم.

کەواتە ئەگەر سروودی (ئەی رەقیب) بە رووە دیارەکەی تەعبیر لە جەستەی نەتەوە بکات، جەستەی نەتەوە خۆی لە دەنگدا بنوێنێت. ئەوە دەنگدانەوە خۆی لە (زمان/ریتم)ی سروودەکەدا هەڵدەگرێتەوەو هەستی ناسیونالیستی لەخۆدا هەڵگرتووە. دواجار جەستەی نەتەوەو هەستی نەتەوە لە (ئالآ)دا بەرجەستە دەبێت.

بەڵام (ئەی رەقیب) بە ڕووە نادیارەکەی لەنێوان دوو گوزارەو دوو بڕگەی دەنگیدا، بێدەنگی یان (سپێتی/بۆشایی) ڕەنگ دەکات. (سپێتی/بۆشایی) بە شێوەیەکی ئاسۆیی لە سروودی (ئەی رەقیب) بە (نەست/چەپێنراو)ەوە دەلکێ، دواجاریش هەوڵدەدەم ئەو بێدەنگییەی (دڵدار) بە (ئالآ/جوانی) ببەستمەوە، بەڵام ئەگەر نەتەوە لە رێگەی شۆڕش- بەرگریکردنەوە (ئالآ) بەرز بکاتەوە، ئەوە (دڵدار) لە رێگەی جوانی بێدەنگی سروودی (ئەی رەقیب)ەوە (ئالآ)ی خۆی هەڵدەکات.

واتــە ئــالآی نەتــەوە بــە شــۆڕش و بەرگریکردنــەوە پەیوەســتەو قودســییەتی (ئــەی رەقیــب)، بــەو مانایــەی کــە هــەڵگری هەســتی ناســیونالییە، درێــژی دەکاتــەوە. بــەڵام ئــالآی خــودی (دڵــدار) وەك

تاك بە بێدەنگییەوە بەندەو جوانی، بەو مانایەی کە تەعبیر لە سپێتی دەکات درێژەی پێدەدات.

(جان کۆهین) دەڵێت: دەبێ هەموو بەیتە شیعرێ پەیڕەوی وەستان بکات، جا چ درێژ بێت یان کورت، ئاسۆیی بێت یا بەرز بێتەوە[٦٤].

لێرەدا مەبەستم نییە، جۆرێك لە قودسییەت بەو گوتەیە ببەخشم و پێموابێت ئیتر گوتەیەکە قابیلی لێکدانەوەی جیاوازو راڤەکردنی جیاواز نەبێت، بەڵام ئەوەی لەو گوتەیەدا دەمەوێت بیخوازم چەمکی ((وەستان))ە، بە مانایەکی دیکە هەوڵدەدەم لە رێگەی چەمکی ((وەستان))، چەمکی بێدەنگی و سپێتی لاپەڕە زێتر روون بکەمەوە.

لە لایەکی دیکە بەر لەوەی قسە لەو گوتەیەی (کوهین) بکەم، دەمەوێت لە تەواوی وزەکانی ئەو نووسینەدا جەخت لەوە بکەمەوە، کە سروودی (ئەی رەقیب) لەلایەك ئاوێنەی بەرگری کوردییە، لەلایەکی دیکە ئاوێنەی بەرگریی خودی (دڵدار)ە.

بەڵام ئەگەر بەرگریی منی کوردی لە دەنگ و دەنگدانەوەی زمانی حەماسییەوە سەرچاوە بگرێ، ئەوە بەرگریی منی (دڵدار) لە نەست و سپێتی لاپەڕەدا خۆی دەنوێنێ، هەر لەوێشەوە بەبێدەگی (دڵدار)ەوە پەیوەست دەبێت.

---

[64]. بڕوانە: جان کوهین، بنية اللغة الشعرية، ترجمة: محمد الولي ومحمد العمري، المغرب ١٩٨٦ل٥٨.

کەواتە لەتوێی مەدلولاتی سروودەکەدا ئەگەر دەنگی (نەتەوەی کورد) لە رەمزی (میدیا-کەیخوسرەو)دا خۆی بنوێنێت، ئەوە دەنگدانەوە تەعبیر لە زیندوویێتی هەستی ئەو نەتەوەیە دەکات، کەواتە ئەوە زیندوویێتی کوردییە هەر لە سەردەمی بەرگریی و شۆڕشەوە (ئەی رەقیب) بەرەو ئێستا درێژی دەکاتەوە.

بەڵام دەشێ بڵێین ئەگەر زیندوویێتی (دڵدار) پەیوەندی بە سروودی (ئەی رەقیب)ەوە هەبێت، ئەوە لە نەستی (دڵدار)و گومانی خوێنەری پێنجەم بەرجەستە دەبێت، گومان و نەستی (دڵدار) دەکەوێتە میانی بێدەنگی و بۆشاییەکان و سپێتیی لاپەڕەوە، یان بە مانایەکی دیکە وەك (کۆهین) بە ((وەستان)) ناوزەدی دەکات، جا چ چەمکی وەستان تەعبیر لە وەستانی نێوان دوو بڕگەو دوو گوزارە بکات، یان پەیوەندی بە سپێتی لاپەڕەوە، سپێتی نێوان دوو بڕگەو دوو گوزارە هەبێت. بۆ نموونە ئەگەر تەماشای گوزارەی (مردن و زیندوویێتی)، (نایڕمێنێ و هەرماوە)، (زیندووە-زیندووە)و (جانفیدانە-جانفیدانە-جانفیدان) بکەین، هەست بەجۆرێك لە بۆشایی/سپێتی دەکەین، ئەو (بۆشایی/سپێتی)یانە لە بێدەنگی هەڵقوڵاون، وەك گوتمان گومان پەخش دەکەن، دەشێ روویەك لە رووەکانی گومان لە بێدەسەڵاتی منی زمانی (ئەی رەقیب)ەوە سەرچاوە بگرێت، لە روویەکی دیکە لە بێدەسەڵاتی منی نەتەوەی کورد. بڕوانە دێڕی (١، ٢، ٧، ٨، ١٢).

کەواتە کاتێك (دڵدار) لە بەرامبەر (زیندووبوون) گوزارەی (مردن) دەخاتە ڕوو، دیارە بڕوای پتەوی بە زیندوویێتی نییە، هەروەك چۆن دووبارە کردنەوەی وشە، یان مانای وشە بە

وشەیەكی دیكە، یان جەختكردن لە وشە، ئەگەرچی لەلایەك بە زۆر مانا حەزی دەسەلأت ڕەنگ دەكات، بەلأم لەلایەكی دیكە دلەڕاوكێ دەنوێنێ، لەنێوان حەزی دەسەلأت و دلەڕاوكێ، وەك گوتمان بۆ خودی (دلدار) گومان دەبێتە هۆی بێدەسەلأتی. بەلأم بۆ خودی كوردی بێدەسەلأتییە گومان بەرهەم دینێت.

كاتێك لای منی (دلدار) گومان دەبێتە هۆی بێدەسەلأتی بەو مانایەیە كە (دلدار) هەمیشە وەك شاعیر گومان لە بێدەسەلأتی زمانی نووسینی خۆی دەكات، بەلأم بە نیسبەت منی (كوردی) لە بەر ئەوەی لە ناوەوە هەلگری منێكی ئەكتیڤ و بە توانا و دەسەلأتدار نییە، بۆیە هەمیشە گومان لە (ئەویدیكە) دەكات و پێیوایە هەمیشە (ئەویدیكە) بۆ رەشكردنەوەو لەناوبردنی خۆی بۆ لە بۆسە ناوە.

لە دەرئەنجام دەتوانین بلێین سروودی (ئەی رەقیب) هەلگری دوو خەسلەتە، یەكێكیان بە بەرگری كردنی نەتەوەو هەستی ناسیونالیانەی نەتەوە پەیوەستەو تەعبیر لە واقیعی كوردی دەكات، هەر لەوێشەوە دەشێ قودسییەتی (ئەی رەقیب) بەرجەستە بكەین و هەموو ئەوەش ڕووی دیاری سروودەكەی لەخۆدا هەلگرتووە. ئەویدیكە بە ڕووە نادیارەكەیەو پەیوەستە، بێدەنگی (دلدار)و سپێتی لاپەڕە دەنوێنێ، تەعبیر لە گومانەكانی نەستی (دلدار) دەكات، دەكەوێتە ئەودیووی زمانی حەماسییەوە.

خەسلەتی یەكەم لە سروودی (ئەی رەقیب) زۆر لە دووەم زالترە، بۆیە ئەركی زمان لە سروودی (ئەی رەقیب) خۆی لە

گواستنەوەی خەسڵەتی یەکەمدا هەڵدەگرێتەوە، نەك خەسڵەتی دووەم.

لێرە لەو کەشفکردنەدا ئەگەر سروودەکە لە حەماسەتی جەستەی زمانەوە بەرەو ئەو دیو حەماسەتی نەستی (دڵدار) بچێت، یان بە مانایەکی دیکە ئەگەر دەنگ لە سروودی (ئەی رەقیب) لە (کورد زوبانەوە) خۆی بنوێنێ، ئەوە دەنگدانەوە لە (هەستی ناسیونالی)یەوە بەرجەستە دەبێت، لەنێوان دەنگ و دەنگدانەوە شاعیر بە ڕووە دیارەکە تەماهی کورد زومان دەبێت، یان لە نێوان رەمزی نەتەوە (میدیا-کەیخوسرەو) و بەرگری هەستی ناسیونالیستانەی شۆڕش و ئالای کوردی تەماهیبوونی (دڵدار) هەڵدەگرێنەوەو لەوێشەوە قودسیەتی (ئەی رەقیب) دەردەکەوێت.

وەك چۆن بە ڕووە نادیارەکە بێدەنگی، (دڵدار) تەماهی سپێتی لاپەڕە دەکات و ئالای جوانی لە (نەست/چەپێنراوەکان)دا کپ کردووە. یان بە مانایەکی دیکە وەك خوێنەری پێنجەم دەیبینێ (دڵدار) ئالای جوانی لە گومان هەڵدەکات. بەڵام دەستەواژەی (کوردزبان) ئەگەرچی بە گشتی زمانی (دڵدار)ە، بەڵام وەك تاك زمانی دڵدارە بە نەنووسراوەیی و پەیوەندی بە بێدەنگی و سپێتی لاپەڕەوە هەیە.

کەواتە بە هەردوو ڕووەکە (دڵدار) وەك منی کوردی، وەك منی شاعیر، دەبێتە هەڵگری ئالا، بەڵام ئالایەك رەمزی کوردایەتییەو ئەوی دیکە ڕەمزی گومان.

(١)

وەك دیارە هەر لە دەستپێکی سروودەکەوە بە گوزارەی (کورد زوبان) جەستە پێش زمان دەخات، دەنگ پێش دەنگدانەوە

دەکەوێت، دەشێ خستنە پێشەوەی جەستە ڕێخۆشکەرێك بێ بۆ ئاماژەکردن بە (جوگرافیا/کوردستان)، واتە ئەگەر لە گوزارەی (کورد زوبان)ەوە دەسپێکی خوێندنەوەمان دیاری بکەین، دەتوانین لە دەرەنجامدا بەرجەستەکردنی جەستەی کوردی لە بەرجەستە کردنی میدیا-میرنشینە کوردییەکانەوە هەڵگرینەوە، بە دیووەکەی دیکەش بەرجەستەکردنی کوردی ڕاستەوخۆ بەرجەستەکردنی جەستەی سروودی (ئەی ڕەقیب) دەگەیەنێت.

بەڵام ئەگەر دەنگدانەوەی کوردی لە دەنگەوە تەماشا بکەین، ئەوە لەو حاڵەتەدا زمان دەبێتە دروستکەری هەستی ناسیونالیستی و زیندوویێتی ڕۆحی نەتەوە، بە مانایەکی دیکە لەنێوان جەستەی سروودو جەستەی کوردی، زمان ڕۆحی هاوبەشەو هەردوو جەستە بەیەکەوە دەلکێنێت، ئەو ڕۆحە ئەگەر بۆ کورد جەوهەری جەستەو زیندوویێتی جەستە بگەیەنێت، ئەوە بۆ سروودەکە لە ڕووی هونەرییەوە ئەو وزە گەورەیەی پێ نییە، بەڵکو تەنها وەك ئامرازی گەیاندن کار دەکات.

کەواتە گوزارەی (کوردزوبان) هەر تەنها گوزارەیەکی ئاسایی نییە، بەڵکو جەستەو ڕۆحی کوردی هەڵگرتووە، وەك چۆن جەستەو ڕۆحی سروودەکەش لەخۆ دەگرێت، بەنیسبەت یەکەمیان کورد وەك جەستە ناونیشانە، لایەنە ماددیەکەی نەتەوە وێنە دەکا، زمان لایەنە مەعنەوییەکەو ڕۆحی نەتەوە دەگەیەنێت، بەڵام بە نیسبەت دەق (کورد) دەنگی سروودەکەیەو (زمان) تەعبیر لە دەنگدانەوە دەکات، لێرەدا کورد بە (میدیاو کەیخوسرەو) یەکسانە، بەڵام زمان دەلالەتەکانی بزاڤو بەرگری و شۆڕش دەگەیەنێت، لەنێوان (کورد + زوبان)دا ئاڵا دەبێتە ڕەمزی شۆڕش، ڕەمزی بزاڤو بەرگری و سەرهەڵدان، بەڵام لەنێوان

(جەستەی سروودو جەستەی زمان) مانا، کورد بوون دەگەیەنێت، دەلالەتەکانی مانا دەبێتە ئالأ بۆ ئەو کوردبوونە، دواجار دەنگو دەنگدانەوەی، ماناو دەلالەتەکان خۆیان لە تەواوی (ئەی رەقیب)دا هەڵدەگرنەوە، (مەبەستمان "ئەی رەقیب"ە لەنێو گەلی کورد، وەك شێوەیەك لە شێوەکانی یادەوەری).

(٢)

لای (دڵدار) زمان وەك ڕەگەزێکی زیندووی ناسنامەی کوردی لە سروودەکە دەردەکەوێت، لەوێشەوە دەنگو دەنگدانەوە دێتە ئاراوە، بەو مانایە دەنگ، ئەگەرچی لەلایەك هەڵگری جەستەی سروودەکەیە، لەلایەکی دیکە هەڵگری ئاماژەکانی ناسنامەی کوردییە. کەواتە کورد لە جەستەی سروودا (مانا- دەنگ) دەگەیەنێتو زمان (دەنگدانەوە- ئالأ) رەنگدەکات.

لەلایەکی دیکە لەنێوان (کورد-زوبان) وەستانێك هەیە، ئەو وەستانە دەشێ تەعبیر لە بەرگریی خودی (دڵدار) بکات، بەڵام بزاڤو بەرگرییەکی گوماناوی یان وەك گوتمان بزاڤو بەرگرییەك کە دەشێ لە بێدەسەڵاتییەوە سەرچاوە بگرێ، ئەو بێدەسەڵاتییە وەك لە خوێندنەوەی یەکەم ئاماژەمان بۆ کرد بە پرۆسەی نووسینی شیعرەوە بەندمان دەکات.

گوزارەی (کوردزوبان) لەنێوان (میدیاو کەیخوسرەو)و (شۆڕش) لە خاڵێکی دیاریکراو بەیەکدەگەنەوە، بەڵام لەچەندان خاڵ لە یەکتر جیادەبنەوە، خاڵی بەیەکگەیاندنیان ئالأیە، (ئایین- نیشتمان -ڕابردوو) بە جۆرێك لە جۆرەکان دەبنە هۆیەك لە هۆیەکانی ئەو بەیەکگەیاندنە، بڕوانە دێڕی (٣، ٤ -٥، ٦).

واتـه ئەگـەر (میـدیاو کەیخوسـرەو) وەك ڕەمـزی نەتـەوە (کـە دەڵێم ڕەمزی نەتەوە مەرج نییە مەبەست لـە نەتـەوەی کـورد بێـت، دەشـێ وەك خـوازە تەماشـای بکـەین) لـە پێنـاو نیشـتمان خـۆی کردبێتـە قوربـانی و ئـەو قوربانییـەش لـە ڕەنگـی سـوور ماناکـانی خۆی دیاری بکات، ئەوە بوونی کـورد لـە جەسـتەی سروودەکەدا بـە قـەد ئـەوەی بـوونی خـۆی لـە ماناکـانی بەرگریـدا دەدۆزێتـەوە، هێنـدە (میـدیاو کەیخوسـرەو) ڕۆڵ نـاگێڕن، دیارە مەبەسـتمان لـە یەکەمیان بەردەوامیەتە، بە مانایەکی دیکە (میدیاو کەیخوسـرەو) دەکەونە ڕابردووەوە، بەڵام بەرگری درێژەی هەیە، ئەگـەر بـەرگری تەرجەمـەی سـروودەکە بکـەین ئـەوە زمـان دەگەیـەنێت، واتـە لـە بەرامبـەر بـەرگریکردنی کـوردی لـە بـوون، لـە سـروودەکەدا زمـان درێژە بەبوون دەدات.

(میـدیاو کەیخوسـرەو) لـە سـروودەکەدا دەشـێ جوگرافیـاو نیشتمان بێت، یان بە مانایەکی دیکە زەوییەکی بە پیت بێت، بۆ دەنگدانـەوەی سـروودەکە، بۆیـە دەتـوانین بڵـێین مانـەوەی (ئـەی ڕەقیب) بەبێ ڕەمزی (میدیاو کەیخوسرەو) مانەوەیەکی ناتەواوە. وەك چۆن لە بەر ئەوەی کوردی ئەمڕۆ وەك ئیبداع وجودی لەقە، بۆیە مانـەوەی نەتـەوەی کـورد بەبێ ڕابردوو، بە بێ زمان، بـەبێ ڕۆحـی نەتـەوەو هەسـتی ناسـیونالی مانەوەیـەکی لـەرزۆك و ناتـەواوە. واتـە لـە دەرکەوتـەی بـوونی نەتـەوەدا، هـەموو مانەوەیـەکی جـوگرافی بـێ ئـاڵا ، دواجـار وەك مانەوەیـەکی بـێ ئامانج دەمێنێتەوە، بە مانایەکی دیکە لە نێوان نیشتیمان و ئاڵادا پەیوەندییـەکی پتـەو هەیـە، بـەڵام بەشـێکی زۆری پتـەوی ئـەو پەیوەندییـە ڕاسـتەوخۆ لـە نـەبوونی ئیبداعدا دەردەکـەوێت، واتـە ئـەوە نـەبوونی ئیبداعـە ئـەو پەیوەندییـە تـا ئـەو سـنوورە مـەزن

نیشان دەدات، بە دیووەکەی دیکە ئەوە ئیبداعە لە دەرکەوتەی بووندا تەواوی سنوورەکان تێکدەشکێنێ، ئالآی تایبەت بەخۆی هەڵدەکات.

بەلآم وەك لە بەدواداچوونی (ئەی رەقیب)دا دەبینین، کە کورد وەك جەستەو جوگرافیاو نیشتمان بوونی خۆی بە رەمزی رابردووەوە بەند دەکات، زمانیش دەبێتە ریتمی ئەو بوونەو ئالآی ڕۆحی ئەو نیشتمان‌و جوگرافیایە.

کەواتە خاڵی هاوبەشی (کورد–زوبان) ئەو خاڵەیە کە لە قوربانی‌و بەرگریدایەو خۆی لە رەمزی ڕابردوو درێژ دەکاتەوەو لە ئالآدا بەرجەستە دەبێت، بەلآم خاڵە جیاوازەکان دەکەونە نێوان گوزارەکانی (زیندوو – مردوو) (نایڕمێنێ– هەرماوە).

ئەگەر گوزارەی (هەرماوە) وەك مانا وەرگرین، دەبینین زێتر وەك هەواڵێك خۆی دەنوێنێ، بە رابردووەوە بەندمان دەکات، بەلآم (نایڕمێنێ) جۆرێك لە تەئکیدکردن‌و بەردەوامییەتی لەخۆدا هەڵگرتووە، هەروەها (هەرماوە) بە شێوەیەکی ئاسۆیی ڕێدەکات، بەلآم (نایڕمێنێ) بە شێوەیەکی ستوونی ئامادەباشی هەیە، بە دیووەکەی دیکەش ئەگەر لە جەستەی سروودەکە سەیری بکەین لەوێ (هەر ماوە) دەبێتە هەڵگری جەستەی کوردی، بەلآم (نایڕمێنێ) زمانی ئەو جەستەیە درێژ دەکاتەوە، بە مانایەکی دیکە (هەر ماوە) دەنگەو (نایڕمێنێ) دەنگدانەوە.

لە لایەکی دیکە لەنێوان (لاو) بە مانای هێزی سەردەم‌و ((میدیاو کەیخوسرەو) بە مانای ڕەمزی رابردوو، لەنێوان ئەمڕۆو دوێنێ، لەنێوان ساتەوەختی ماناو کاڵبوونەوەی مانادا خۆیان دەنوێنن، هەر وەك چۆن ئەمڕۆو دوێنێ جیاوازیگەلێگ بەڕێوەی

دەبـات، هێـزی (لاو)یـش لـەمڕۆو دوێنـێ دنیایـەك جیـاوازی دەنوێنێ.

(٣)

کەواتـە جەسـتەی کـوردی لـەنێوان ئـەمڕۆو دوێنـێ لـەنێوان لاوانـی ئـەمڕۆ ڕەمـزە نەتەوەییـەکانی دوێنـێ، نـەمریی خـۆی لـە دەنگدانـەوەدا هەڵدەگرێتـەوە، بـەڵام سـروودەکە لـەنێوان خـودی شاعیرو مانای شیعردا، لەنێوان بۆشاییەکانی بێدەنگی و نەستی شاعیردا گومان دەبێتە ڕەمزو ئاڵای زمانی چەپێنراوی (دڵدار)، یـان بـە مانایـەکی دیکـە تـەواوی نەسـتی شـاعیرو شـیعرییەتی، دەچێتە خزمەت جەستەی کوردی و هەستی نەتەوەییەوە.

لە سروودی (ئەی رەقیب)دا، زمان وەك ئەوەی کە دەکەوێتە بەرچاو هـەڵگری هەسـتی نەتەوەییـە، بـەڵام بەشـێك لـە ونبـوونی خـودی شـاعیرێتی دەشـێ پەیوەنـدی نەنوسـینەوەی زمـان (چـەپاندنی زمـان)و بەشـێکی پەیوەنـدی بـە تەماهیکردنـەوە هەبێت.

هـەر لـە سـەر ئـەو بنەمایـەش خوێنـەری پێنجـەم بەشـی زۆری گومانـەکانی شـیعریی بـە سـپێتی لاپـەڕەو بۆشـایی بێدەنگییـەوە پەیوەسـت دەکـات. بـەڵام خوێنـەری یەکـەم بەشـێکی زۆری بەرجەسـتەبوونی شـیعری لـە ئـاڵاو دەنگدانـەوە هەڵدەگرێتـەوە، ئەوەش بەو مانایەی کە سروودی (ئەی رەقیب) وەك وێردی سـەر زمانی گەلی کوردو مارشی نەتەوە سەیر دەکات.

بەڵام تەماهیبوونی شـاعیر لەوێوە دێت، کە لە پێنـاو هەسـتی نەتەوایەتییـەوە هەسـتی خـۆی دەداتـە دواوە، هـەروەك لـە پێنـاو زمانی حەماسیانەوە زمانی شیعریی وێران دەکات، دەبێت بزانین کە ئیشکالیەتی (دڵدار) بۆ زمان راستەوخۆ پەیوەندی بەوەدایە،

کە لەبری هەموو کورد ئەرکی قسە کردن بەخۆی دەسپێرێت، لەبری هەموو کورد رەمزەکانی مێژوو دەنووسێتەوە، لەبری تەواوی دەسەڵات و هێزی کوردی لاوەکان بۆ مەرگ هاندەدا، لەبری هەمووان بیر دەکاتەوەو نەخشە دادەرێژێت. بە کورتی (دڵدار) لە بری ئەوەی شیعر بە خولیایەکی قووڵەوە بنووسێت، وەك ئەرك هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات و لەوێشەوە دەیەوێت مانایەك بە کوردبوون ببەخشێت، بەڵام بەر لە (دڵدار)یش کوردبوون هەبووە، (دڵدار) دێت تاکو شیعری کوردبوون هەڵبژێرێت، بەڵام جوانی شیعر لەوەدایە، کە مەرج نییە ئێمە هەڵیبژێرین، بەڵکو ئەو بۆخۆی دێت، کەواتە شیعر شێوەیەك نییە، بۆ بردنەوە، یان بۆ بەرجەستەکردنی دۆڕاندنی ئەویدیکە، بەڵکو یارییەکی کراوەیەو هەموو کەسێك ناتوانێت ئەو یارییە بکات. بە مانایەکی دیکە (دڵدار) لەبری ئەوەی شیعر وەك یارییەکی کراوە، وەك پێشبینی تەماشا بکات، یان وەك نووسینەوەی حیکایەتێکی شیمانەیی سەیری بکات، کە رۆژێك لە رۆژان دەشێ هەبێت، دەیەوێت لە رێگەی نووسینەوەی کوردبوونەوە بڵێ هەم، لە رێگەی تەقلیدکردنی کوردبوونەوە دەبێتە رابەرو ئەرکی فەرماندان لە ئەستۆ دەگرێت. بڕوانە:- دێڕی (١١، ١٢، ١٣، ١٤).

لە لایەکی دیکە دەشێ بەشێك لەو حەماسەتە نەتەوەیی و هەستی ناسیونالییە، کە لە (ئەی رەقیب)دایە، پەیوەندی بە تێڕوانین و فیکری سەردەمەوە هەبێت، هەژموونی واقیع و بزاڤی نەتەوایەتی بەرێوەی ببات، وەك چۆن بەشێکی بەرەو هوشیاری کۆمەڵایەتیمان دەکاتەوە. کەواتە دەشێ بڵێین (دڵدار)ی شاعیر (ئەی رەقیب) لە نێوان تێڕوانینی سەردەم و هوشیاری

کۆمەڵایەتییەوە دەنووسێت، بە مانایەکی دیکە دەمەوێت بڵێم (دڵدار) هەرگیز بیر لە وشەی کۆتایی ناکاتەوە، بەڵکو هەمیشە بیر لە هەبوونی خۆی دەکاتەوە، بۆیە زۆر تەقلیدییانە هەبوونی خۆی تەماهی هەبوونی کوردی دەکات، هەر لە سەر ئەو بنەمایە دەتوانین بڵێین دریژبوونەوەی (ئەی رەقیب) لە پرۆسیسەکردنی پەرگیریدایە، بەڵام شاعیری داهێنەر هەر کە وشەی کۆتایی هەڵدا، ئیتر لە بەتاڵیدا دەمرێت، مەرگی نووسەر دەلالەتی لەدایکبوونی خوێنەرە جیاوازەکانی هەڵگرتووە.

بۆیە هەستدەکەین خودی ئەو حەماسەتەی سروودی (ئەی رەقیب) بەرەو جۆرێك لە شۆڤینیەتمان دەکاتەوە، هەموو شۆڤێنیەتێکیش لە وزەی جوانگوتن کەم دەکاتەوە، هەروەك هەستی مرۆڤایەتی دەخاتە دواوە، بە دیووەکەی دیکەش رەهەندو دەلالەتو ماناکان بەرەو بنبەستبوون دەبات.

بە مانایەکی دیکە دەشێ بڵێین زمانی (ئەی رەقیب)، زمانێکی باوکسالارانەیە، زمانێکی دەسەڵاتخوازانەیە، ئێمە لەو خوێندنەوەیە دەپرسین ئایا هەستی شاعیرانەی (دڵدار)، دەکەوێتە کوێ؟ ئایا هەستی شاعیرو شۆرشگێر وەك یەك خوێندنەوەی بۆ دەکرێت؟

راستە هێزی (ئەی رەقیب) بەجۆرێك لە جۆرەکان، خۆی لە ئاوێزانبوونی هەستی شاعیرو هەستی شۆڕشگێڕدا هەڵدەگرێتەوە، ئەو قسەیەش ڕاستەوخۆ لەوێوە دێت، کە نموونەی (شاعیر، هوشیاریی، کۆمەڵایەتی) خۆی بەسەر جەستەو بیرکردنەوەی دەقدا دەسەپێنێت، هەر لەتوێی هوشیاریی کۆمەڵایەتیشەوە هەستی شاعیرو هەستی شۆڕشگێڕ لە جەستەی سروودی (ئەی رەقیب) دەخەینە بەرچاو.

ئەگـەر توندوتیـژی نموونـەی شۆڕشـگێڕ لـە سەرکێشـییە نالۆژیکەکاندا هەڵگرینەوە، ئەوە دەتوانین توندوتیژی شاعیر بە زمـانی باوکسـالارانەوە پەیوەسـت بکـەین. هــەر لەوێشــەوە دەسـەڵاتی شـاعیر لـە دروشمەکانـەوە بەرجەسـتە دەبێـت، بـەڵام نموونەی شۆڕشگێڕ خۆی لە مۆدیلی سیاسیانەدا دەنوێنێ.

هـەروەها ئەگـەر نـالۆژیکی دروشمـەکانی شـاعیرو حەماسـەتی شیعریی وەك ئەوەی کە هەڵگری هەستی شۆڤێنییە، بەرامبـەر بە مرۆڤدۆستی و هەسـتی مرۆڤایەتییـەوە بوەسـتێ، ئـەوە نـالۆژیکی سەرکێشییەکانی شۆڕشگێڕ بە ئەفسانەی سەردەمەوە بەندە.

لێـرەوە دەتـوانین پەیوەنـدیی نێـوان هوشـیاریی (شـاعیر)و هوشـیاریی (شۆڕشـگێڕ) لـە پەیوەنـدی نێـوان سەرکێشـی و دروشمەکانـدا هەڵگرینــەوە، لێکجیابوونەوەشـیان لـە (واقیـع)و (ئەفسانە)دا بگرین، بەڵام ئەگەر هوشیاریی شاعیر وەك پێویست پەیوەندیی بە هوشیاریی ئەدەبییەوە هـەبێت و هوشیاری ئـەدەبی پەیوەنـدی بـە جیهـانبینی وجیـاوازی و ئاسـتی بیرکردنـەوەو قبـوڵکردنی رەنگەکانـەوە هـەبێت، دواجـار هـەموو ئەوانـەش لـە دوتـوێی نووسـیندا رەنگبداتـەوە، ئـەوە هوشـیاریی شۆڕشـگێڕ هوشیارییەکی کۆمەڵایەتییە و بە واقیعێکـی دیاریکراوەوە بەندە، لـە زۆربـەی بـاردا ئەویدیکـە بـە مەترسـی دەداتـە قەڵـەم و هـەر لەوێشــەوە بەشــێکی زۆری جیاوازییــەکانی ئەویدیکــە رەتدەکاتـەوەو هەمیشـە خـۆی بەراسـت دەزانـێ و ئەویدیکـە بـە چەوت دەداتە قەڵەم، تەواوی ئەو بۆچوون و بیرکردنەوەیەشی لە کارە شۆڕشگێرییەکەی دەردەکەوێت.

لێرەدا ئاخۆ هوشیاریی ئەدەبی لای (دڵدار) هوشیارییەکی دروستە؟ بێگومان دروست نییە، چونکە هوشیاری ئەدەبی بەو مانایەی کە هەڵگری جیاوازییەکانە لای (دڵدار) کەمترین رەنگدانەوەی لە سروودی ناوبراودا بەرچاو دەکەوێت، بەڵکو (دڵدار) بەردەوام وێنەی خۆی لە واقیعی تاکە نەتەوەیەکدا بەند کردووە، بەو مانایە هوشیاریی (دڵدار) هوشیارییەکی کۆمەڵایەتییانەو تاك رەهەندو پەرگیرەو زۆرتر بە هەستی نەتەوەی کوردەوە بەندە، هوشیارییەکە دەکەوێتە نێو واقیعی کوردییەوە، خۆی لەئاڵای کوردیدا دەبینێتەوە، سەرەڕای ئەوەش ناشێ وەك هوشیاری شۆڕشگێر سەیری بکەین، چونکە دواجار دەشێ بڵێین هوشیاریی شۆڕشگێڕ خۆی لەسەرووی واقیعدا دەنوێنێ و وێنەی خۆی لە ڕەمزدا بەرجەستە دەکات، وەك چۆن هۆشیاری ئەدەبی داهێنەرانە بە مانا پێشکەوتووەکەی دەکەوێتە سەرووی ئەدەبی لۆکاڵییەوەو خۆی لە ئاستی گلۆباڵدا هەڵدەگرێتەوە.

بێگومان سەدەی بیستەم ئەو دوو نموونەیەی زۆر بە جوانی تیا دەردەکەوێت، نموونەی یەکەم بە دروشم و حەماسەتەوە پارێزگاری لەخۆی دەکات، ئەوی دیکە بەسەرکێشی و خەیاڵەوە، یەکەمیان بڵندگۆی سەردەمە و ئەوی دیکە ڕەمزی سەردەم، بەڵام جیاوازیی نێوان (دڵدار) وەك بڵندگۆی سەردەم و شۆڕشگێڕ وەك ڕەمزی سەردەم، ئەوەیە کە (دڵدار) ڕەمزی تاکە نەتەوەیەکە، کە بە نەتەوەی کورد ناودەبرێ، بەڵام نموونەی شۆڕشگێڕ دەبێتە ڕەمزی هەموو بزووتنەوەیەکی ئازادیخواز هتد.

(دڵدار) له پێناوی هەستی نەتەوە، گرەو لەسەر فرەمانایی و جوانگوتن و فرەڕەهەندی زمان دەکات، وەك چۆن لە پێناو تاك مانایی گرەو لەسەر خودی خۆی و نیگەرانیەکانی خۆی و هوشیاریی ئەدەبی دەکات.

ئەگەر تێکەڵکردنی هەستی نەتەوە وەك ((کۆ))و هەستی (دڵدار) وەك تاك تێکەڵکردنێکی هەرەمەکییانە بێت و پەیوەندی بە نائاگایی پرۆسەی نووسینی شیعرەوە هەبێت، ئەوە لەو حاڵەتەدا، دەتوانین بڵێین دیدی (دڵدار) بۆ دنیا، دیدێکی فریادرەسئامێزە، مەبەستم لە دیدی فریادڕەسئامێز، ئەو دیدەیە کە پشت بە ئەودیوو واقیع دەبەستێت، ئەو قسەیەشم لەوێوە دێت کە لەپشت جەستەی زماندا حاڵەتە دەروونییەکانی (دڵدار)و سپێتی لاپەڕەو بۆشاییەکان دێنە ناوەوە، لە حاڵەتێکی ئاوادا، زمانی نووسین ئەو زمانە نییە، کە بەر واقیع دەکەوێت، بەڵکو ئەو زمانەیە کە خەیاڵ و بیرکردنەوەی (دڵدار) دەنوێنێ.

بەڵام ئەگەر ئەو تێکەڵکردنە، تێکەڵکردنێکی دروستکراوبێ، یان پەیوەندی بە هوشیاریی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەوە هەبێت، دەتوانین بڵێین دیدی شاعیر دیدێکی شۆڕشگێڕانەی لۆکاڵییانەیە، لەو حاڵەتەشدا جەستەی شیعر دەبێتە جەستەیەکی ماددی و دەلالەتەکانی لە بوونی کوردی (وەك جەستە) هەڵدەگرێتەوە.

لەو خوێندنەوەیەدا، وەك دەردەکەوێت (دڵدار) بە ماناکانی هەستی نەتەوەییەوە بەندە، لەوێشەوە خولیای دەنگ، وەك ڕەمزی نەتەوە بە (کورد زوبان)و (میدیاو کەیخوسرەو)، لەلایەك

خولیــای دەنگدانــەوە بــە (بــەرگری/شــۆڕش) لەلایــەکی دیکــە پەیوەسـتە، لەوێشـەوە قسـەمان لـەوە کـرد کـە بـوونی شـاعیر بـە بوونی کۆوە بەندە، لەو تەماهی بوونەشەوە، دواجار قسـەمان لـەو گومانــە کــرد کــە دەکەوێتــە بۆشــاییە دەنگییەکانــەوە، بــەڵام بــۆ ئەوەی بتوانین سپێتی لاپەڕەو بۆشاییەکان بەرجەستە بکـــەین، دەبێــت پــەردە لــە ســەر چــەپێنراوەکانی نەســتی (دڵــدار) هەڵدەینەوەو لەسەر فاکتەرەکانی ژیانی نووسەر کار بکەین.

# باسی سێیەم

## ریتمی ناوەوە

## خوێندنەوەیەکی فۆنۆلۆژی ئەی رەقیب

لێرەدا وەك لە ناونیشانەکە هاتووە بەشێکی زۆری قسەکردن لـە (ئـەی رەقیـب) دەچـێتە خانـەی خوێندنـەوەی فیزیکیانـەی فۆنـەتیك‌و بیسـتنەوە، بـەو مانایـە هەوڵـدەدەین لـە دیـدی فۆنۆلۆژییـەوە ماوەکـانی نێـوان دال و مـەدلول دیـاری بکـەین‌و رەنگدانـەوەی دنیـای دەرەوە لـە دنیـای نـاوەوەی (دڵـدار) هەڵگرینەوە، یان بە مانایەکی دیکە لە رێگەی دنیای بێدەنگی پیتەکانەوە کۆمەڵێك دەلالەتی نادیار بەرجەستە بکەین، کە تەواو لەگەڵ دنیای دیاری (ئەی رەقیب) جیاواز دەکەوێتەوە.

وەك گوتمـان ئـەوەی بـەردەوام ئـەو سـروودە وەك دەقێکـی گونجاو دەخاتە روو ئەو پەیوەندییە پتەوەیە، کە دەکەوێتە نێوان خـودی دەق‌و مێـژووی دەرکـەوتنی هەسـتی ناسـیونالیزمییەوە، ئەو پەیوەندییەش دواجار رەهەنـدی مێـژوویی بە سەر رەهەنـدی دەلالیـدا زاڵ دەکـات، کەواتـە ئـەوەی کـە دەبێتـە شـوێنی خـۆ دۆزینەوەی خوێنەر، بونیادسازی دەق نییە بەڵکو ئەو بونیادەیـە، کە مێـژووی کـوردی‌و مـەیلی ناسیونالیستی لە ساتەوەختێکی دیـاریکراودا بەرجەسـتەی دەکـات، هـەروەك چـۆن پەیوەنـدی ئیستێتیکی نێوان وشەکان نییە بەڵکو بابەتە، کە لەگـەڵ مێـژووی نەتەوەیی چاکسازی دەسازێنێت.

له دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییەوە دەتوانین بڵێین (ئەی رەقیب) وەك جەستە دەبێتە رووداوێکی مێژوویی، بەڵام وەك بونیادسازی و کارکردن لە پەیوەندییەکی داخراودا خۆی قەتیس دەکات.

دەشێ لەوێوە وەك رووداوێکی مێژوویی سەیری جەستەی (ئەی رەقیب) بکەین، کە توانیوویەتی دیاردەی ناسیونالی بە شێوەیەکی پەتی لە ئاگایی دەرەوەو ناوەوەی کوردی جێگیر بکات، بۆ بەدواداچوونی ئەو جێگیر کردنەش چەمکی شیعرییەتی جێگیر بە کار دێنین، بەڵام دەشێ لەوێوە دوچاری بنبەستبوون بین، کە کاری خوێنەری جیاواز لە پڕکردنەوەی بێدەنگی و تەواوکردنی وشەکان و ماوەی نێوان دال و مەدلول کورتی دێنێت. لە نێوان دەنگی جیاوازو دەنگی قەتیس ماو، یان لە نێوان شیعرییەتی جێگرو پرشنگی دەلالەتەکان، کۆمەڵێك خوێندنەوەو راڤەو لێکدانەوەی جیا دێتە بەرهەم، بەڵام من لێرەدا هەوڵدەدەم لە بونیادی بڕگە کورت و درێژەکانی وشەوە شیعرییەتی جێگیرو هەڵچوون، دەلالەتە شاراوەکانی نێو دەق بەرجەستە بکەم، لە سەر ئەو بنەمایەش هەوڵدەدەم رووی دووەمی قسەکردن بۆ هەنووکەیی فیزیکیانەی رواڵەت و ناوەڕۆك و چۆنێتی دروستبوونی شەپۆلی دەنگ و چۆنێتی رۆیشتنی ئەو شەپۆلە دەنگیانەو چۆنێتی وەرگرتنیان بگوازمەوە.

یەکێك لەو تیشکۆ بەرجەستانەی کە پەیوەندییەکی جێگیر لەگەڵ مێژوو دروست دەکات، ئەو دەنگە قەتیس ماوەیە کە لە

ڕێگەی (میدیا و کەیخوسرەو) دەردەکەوێت، ئەو دوو تاکە دەنگە وەک ئامراز رەنگدانەوەی بارەکانی هێزو بێهێزین و تەواوی کۆدی سروودەکەیان لەخۆ گرتووە، واتە ئەوەندەی لە شیعرییەتی جێگیر پەنگ دەخۆنەوە، ئەوەندە لە پڕشنگی دەلالی و دەنگدا خۆیان ناسەپێنن، چونکە ئەگەر پڕشنگە دەلالییەکان هەڵگری تەعبیرکردنی جیاواز بن، ئەوە شیعرییەتی جێگیر تەواوی تەعبیرکردنەکان بەخۆوە بەند دەکات.

دەشێ ماوەی نێوان دال و مەدلول بە پێی ئاستی خوێنەرو مێژووی جیاواز، دەلالەتی جیاواز بنوێنن، بەلام شیعرییەتی جێگیر دەنگی قەتیس ماوی مێژوویەکی دیاریکراو (دەنگە خەفەکراوەکانی منی ناسیونالیزمی کوردی) دەگەیەنێت، لێرەدا (کەیخوسرەو) ئەو ڕووداوەیە کە فەزای نێوان دال و مەدلولی ئەم سروودە داگیر دەکات و تەواوی وزەو مانا دیارەکان لە پێناو خۆی دەخاتە کار، نەک هەر هێندە بەڵکو (کەیخوسرەو) ئەو بێدەگییە گەورەیەشە یان ئەو دەنگە خەفەکراوەی منی ناسیونالیزمی کوردییە کە تەواوی دەنگ و پڕشنگە جیاوازەکان دەخاتە ژێر هەژموونی خۆیەوە، ئەو قسەیەشمان بە سروشتی بێدەگی ئەو پیتە نەبزۆکانەوە پشت ڕاست دەکەینەوە کە کۆتایی ڕستەی سروودەکە پێکدەهێنن، بڕوانە هەر دوو نیوە دێری (٥-٦) چۆن لە پیتی (ن)ی نەبزوێنی کۆتاییدا خۆیان دادەخەن.

ئەگەر سروشتی ئەو داخرانە بۆ سەرەتایی نیوە دێرەکان بگەڕێتەوە دەبینین نیوە دێری (٥) بە وشەی (ئێمە) دەست پێدەکات، وشەی (ئێمە) سەرەڕای ئەوەی کە بە هۆی پێتە بزوێنە

درێژەکەیەوە وەك وشەیەکی بزۆز خۆی دەنوێنێت، وەك ماناش کۆی وزەکانی لە هێزی ناوەوەدایە، ئەو هێزە لە نیوە دێری (٦) خۆی لە بەرزترین پیتی بزوێنی درێژ کە (ا)ی (دینمان- ئاینمان- نیشتمان)ە هەڵدەگرێتەوە، بەڵام دواجار کە سەیر دەکەین بەشی زۆری کۆتاییەکانی ئەو سرووده، یان سەروای دێرەکان بە پیتی نەبزوێنی (ن) دێت. پیتی نەبزوێنی (ن) تەعبیر لە جۆرێك پەناو پێچیو هەڵچوونی نادیاری ناوەوە دەکات، سەرەڕای ئەوەش درێژی بڕگەکان بە حاڵەتی دەروونییەوە بەندەو خاوییان تەعبیرکردنی پێچاو پێچی تۆختر دەکەنەوە.

کەواتە ئەگەر تەواوی ماناکانی (ئەی ڕەقیب) لە خزمەتی بوونی کوردی خۆی ڕێك بخاتو بنەمای ئەو بوونەش لە ڕێگەی بە نێوداچوونی مێژوودا پراکتیزە بکرێت، ئیتر لێرەوە پێناسەمان بۆ شیعرییەتی جێگیر لە بەیادهێنانەوەدا بەرجەستە دەبێت، بەو مانایەش بەیادهێنانەوەی (میدیاو کەیخوسرەو) بەیادهێنانەوەی کۆی ئەو مەیلو گوتارانەش دەگرێتەوە، کە بوونی کوردی لە سەر بونیاد دەنرێت، لێرە شیعرییەتی جێگیر دەشێ دوو تێڕوانین لەخۆ بگرێت، یەکەمیان ئەوەیە کە سروودی (ئەی ڕەقیب) بەرەو ناوەڕۆکی بوونی کوردی دەکاتەوە. دووەمیان هەر دوو دەنگی (میدیاو کەیخوسرە) وەك (ڕووداو) لێوردبوونەوەیەك دەسازێنن، کە بە دەوری پاکبوونەوەدا دەخولێتەوە، بەو مانایەش (میدیاو کەیخوسرەو) لە لایەك وەك بابەت بوونی کوردی بە یەك دەبەستنەوە، لە لایەکی دیکە ئەو بونیادە رووتە بەرجەستە دەکەن، کە دەشێ پاکبوونەوەی کوردی

پـێ پێوانـه بکرێـت؟!. یەکـەمیان جۆرێکـە لـە وەفـا بـۆ بابـەتو هەمیشـە ئەمـەك نوانـدنیش بـۆ بابـەت، ئەمـەك نوانـدە بـۆ کـۆو تـەعبیر لـە رەتکردنـەوەی خـود دەکـات، ئـەو رەتکردنەوەیـە وەك دەردەکـەوێت تـاك مانایيـەك دەخاتـەوە، کـە ملکەچـی رووداوی مێـژوویی و دەروونییـە، بـەڵام دووەمیـان مانـا، روون دەکاتـەوەو بوونی کوردی دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە، لـە دووتـوێی وەفـا نوانـدن بـۆ بابـەتو روونکردنـەوەی مانـا شـیعرییەتی جـێگیر قـەتیس دەبێت، چونکە لە بری ئەوەی وەك ئاوێنە پڕشنگی بەردەوامی بە منـی کـوردی ببەخشـێت، وەك بیرخەرەوەیـەکی نـەزۆكو پـیرۆز خۆی بەیان دەکات.

کەواتـە لـە لایـەك شـیعرییەتی جـێگیر تـەعبیر لـە کـۆی ئـەو دەنگە خەفەکراوەی ناوەوەی منی ناسیونالیزمی کوردی دەکات، لـە لایـەکی دیکـە وەك بنەمایـەك ئاماژەکـانی بـوونی کـوردی یـاد دەخاتەوە، وەك گوتمان بۆ پشـت راسـتکردنەوەی ئـەو رسـتەیەش لێکدانەوەکانمان لـە فۆنۆلۆژیـاوە دادەمـەزرێنینو هـەر لـە رێگـەی پێشـبینیەکانی بێـدەنگی و دەنگیشـەوە کاریگـەری ریتمـی ناوەوەو رەنگدانەوەکان دەگرین، بەو مانایە دەشـێ کـۆی دنیـای ناوەوەی (دڵدار) لـە (ئـەی رەقیـب)دا بەرجەسـتە بکـەین، نـەك هـەر وەك ناوەڕۆك بـەڵکو وەك ئاسـتی پێکهاتـەو پێکهاتـەی دەنگیش، کەواتـە دەتـوانین بڵـێین پێکهاتـەی دەنگـی کـۆی ئـەو حاڵەتـە دەروونییـەو ئاگاییانەیـە کـە نووسـەر لـە پرۆسـەی نوسـیندا بـە نێویدا گوزەر دەکات.

سەرەتای ئەو باسە بە هەڵبژاردنی نازناوی (دڵدار) دەست پێدەکەین، چونکە ئەو هەڵبژاردنە بە مەبەستو نیازێکی ئاگاییانەوە بەندە، وشەی (دڵدار) وەك دەربڕین دوو جولە بەرجەستە دەکات، جولەیەکی نەرم لە پیتی (د)ی سەرەتاییەوە، جولەیەکی بەرز لە پیتی بزوێنی (ا)ەوە، دواتر ئەو دوو جولەیەش لە پیتی (ر)ی نەبزوێندا کتو پڕ دەکەون. کەواتە وشەی (دڵدار) دەشێ لە نێوان پیتی (د)و پیتی (ر) دوو تێڕوانین بەرجەستە بکەن، پیتی (د) جۆرێك لە دەم درێژ کردن بۆ ژیانو جۆرێك لە هەنگاونان بەرەو ژیانی تێدا دەبینرێت، بەڵام پیتی (ر) سەرەڕای ئەوەی وەك دەربڕین نادیارو کەمخوێنە، وەك رواڵەتو وێنەش لاربوونەوەو کەوتنو ونبوون دەنەخشێنێت، بەو مانایەش پیتی (ڵ) ئەگەرچی ناکەوێتە سەنگەری پیتی (ر)ەوە، بەڵام ناشکەوێتە بەرگری کردن لە پیتی (د)ی دەسپێك.

کەواتە ئەگەر (د)ی ناوەڕاست نەبێت وشەی دڵدار رەنگە ئەو ژیانەی پێ رەوا نەبینرێت، دەمەوێت بڵێم پیتی (د) ناوەڕاست جەخت کردنە لە پیتی (د)ی سەرەتا، هەر ئەو جەخت کردنەشە وا دەکات دڵدار زۆر بە لەز دەنگ بەرز بکاتەوە. بەو مانایە وشەی (دڵدار) وێنەی هەنگاونان بەرەو ژیانو پاشان دەنگدانەوەیەکی بەرزو پاشان لاربوونەوەو ونبوون رەنگ دەکات.

بەڵام وەك دیارە دەسپێکی سروودی (ئەی رەقیب) بە وشەی (ئەی) تەعبیر لە حاڵەتێکی دەروونی دیارو نادیار دەکات، هەروەها سروشتی ئەو وشەیە وەك دەربڕینی دەنگیو ریتمی ئەو سروودە لە هێرشکردندا خۆی هەڵدەگرێتەوە، بەڵام کە

دەگاتە وشەی (رەقیب)و دەکەوێتە سەر دەربڕینی پیتی (ب) ئەو هێرشەی دەسپێك دەکەوێت و ئیتر لەوێوە وشەی (هەر) وەك ریتم تەعبیر لەو خاوبوونەوەیە دەکات، سەرەڕای ئەوەی وشەکە بە پیتی (ر) کۆتایی هاتووەو پیتی (ر) بێدەنگ و داخراوە، بەڵام وەك دیارە دەسپێکی وشەکەش بزۆك و کراوە نییە. بەمجۆرە لە نێوان پیتی (ه) ی داخراوو پێچاو پێچ و پیتی (ر)ی بێ هێزو کەمخوێندا کورتە بزوێنی (ە) دەکەوێت، ئەو کەوتنە لە رێگەی خاوبوونەوەکەیەوە، خاوبوونەوەیەك کە جۆرێك لە دوودڵی و بۆشای دەخاتە نێوان وشەی (رەقیب)و وشەی (کورد)ەوە، وەك لە خوێندنەوەی پێشوودا ئاماژەم بۆ کرد ئەو دوودڵی و بۆشاییە هەڵگری گومانێکە کە دەکەوێتە نێوان بوون و نەبوونی کوردییەوە.

لێرەوە وەك چۆن لە رووی ریتمەوە هەموو کۆتایی هێنانەکان بە پیتی نەبزوێنی (ن)ی کۆتاییەوە جۆرێك لە داخرانی لەخۆ گرتووە، لە رووی ماناشەوە جۆرێك لە کت و پڕی دەگەیەنێت، بڕوانە ئەو نیوە دێرانەی بە وشەی (زوبان–زەمان–نیشتمان–نێژران...هتد) کۆتاییان دێت، کەواتە دەربڕینی پیتی (ن)ی کۆتایی لەو نیوە دێرانەدا ئەگەر راستەوخۆ تەعبیر لە دابڕان و داخران نەکات، ئەوە خاوبوونەوەیەکی ئەوەندە بەهێزە کە گومان لە زیندوویێتی و هەناسەدانیان دەکرێت. بەڵام لە لایەکی دیکە پیتی (ن) ئەوەندەی وەك دەربڕین بێ وزەیە، ئەوەندەش لە ناوەوە ئەزموونداره، ئەزموونداری ئەو پیتە لەوێوە دێت کە دەیەوێت بەر لەوەی پەلەی گوتنی بێت بە بێدەگی بەنێو خۆیدا

شـــۆڕ بێتـــەوە، بـــەر لـــەوەی هـــەنگاو بهاوێـــژێت، دەســـت بـــە لێوردبوونـــەوە بکـــات. راســـتە پیتـــی (ن)ی کۆتـــایی بـــێ وزەو بێدەنگە، بەڵام ئەزموونی ئەو پیتە خۆی لەو کاتە چڕ دەکاتەوە کە لە خۆیدا هەڵیگرتووە.

لە نیوە دێری (٢) وشەی (نایرمێنێ) بە پێشگری (نا) یان بە وشـەی (نـا) خـۆی زاڵ دەکـات، ئـەو خـۆ زاڵکردنـەش بـە هـۆی بزوێنـەرە بەرزەکـەی (ا)ەوەیـە، ئیتر لـەو دەنگـە بـەرزەوە بێـدەنگی پیتـــی (ن)ی ســـەرەتا توانـــای بەدواداچـــوون و بیرکردنـــەوەو لێوردبوونەوەی بە دەستەوە نامێنێ و ئیتر جگە لە ملکەچ کردن و خۆ بەدەستدان ناتوانێت هیچ دەلالەتێکی دیار بەرجەستە بکات، بەڵام ئەوە هەرگیز بەو مانایە نییە کە خەسڵەتەکانی خـۆی ون کردبێت، دەشێ لەو حاڵەتە خۆ بەدەستدان جۆرێکیش بێت لە نـاڕازیبوون، نـەك نـارازیبوون لـە بـوون، بـەڵکو نـاڕازیبوون لـە حاڵەتێکی دیاریکراوو سنووردار. لە لایەکی دیکە ئەو نیوە دێرە جۆرێك لـە سەرکێشـی پێیـەو تـەواوی دەلالەتـەکان دەخاتـە ژێـر ئاڵای بـەرزترین دەنـگ کـە (ا)ە، دواجـار کـۆی ئـەو مانایانـەی کـە دەکەونـە نێـوان وشـەی دەسپێك و وشـەی کۆتـایی هـەموو لـە دەنگی (ن)دا کۆ دەبنەوە، بەو مانایە ئەوە پیتی (ن)ە کە جولەی بـەرزترین و درێـژترین پیـت دەخاتـە نێـو خۆیـەوە، کەواتـە نیـوە دێـری (٢) کـە تەواوکـەری نیـوە دێـری یەکەمـە جگـە لـەوەی کـە بـەرەو بێـدەنگی و داخرانمـان دەکاتـەوە، بـەرەو جۆرێـك لـە گومانیشمان دەبات.

نێوە دێری (٣-٤) لە وشەی (ئێمە)ی دەسپێك‌و کۆتایی هاتن بە وشەی (رابردوو) جگە لە بیرخستنەوەی رابردوو، یان بەرجەستەکردنی رابردوویەك کە زۆر بە جوانی لە رێگەی (میدیاو کەیخوسرەو) جەختی لێدەکرێتەوە شتێکی دیکە نییە، ئەو بەیادهێنانەوە لە لایەك بەشێك لە هێزو وزەمان بە نادیاری دەسپێرێت، لە لایەکی دیکە بەشێکی بەو خاکەوە بەند دەکات کە بە نیشتمان ناو دەنرێت، بەڵام ئایا نیشتمان بە داهێنانی ئەو سروودە دەژمێردرێت؟

نیشتمان ئەو خاکەیە کە نەتەوەیەکی دیاریکراوی لە سەر دەژیت، ئەو نەتەوەیە ئەو خاکە دیاریکراوە بە خاکی خۆی دەزانێت، چونکە ئەگەر خاك نەبێت هیچ نەتەوەیەك ناتوانێت هۆیەکانی دیکەی بوون‌و مانەوەی بپارێزێت (جگە لە یەهود نەبێت) بەڵام دووبارە خاك داهێنان نییە، بەڵکو هۆکارێکە بۆ پێکەوە ژیان.

بەمجۆرە نیوە دێری (٣-٤) جگە لەوەی هەڵگری گوتاریکی شیعری‌و ناسیونالیستی شێوە دیارو راستەوخۆیە، هەڵگری ریتمێکی راستەوخۆشەو دەنگی بەرزی ئەو ریتمە لە بزوێنی درێژی (ا)دا خۆی دەدۆزێتەوە، هەر لەوێشەوە ئەو دەنگە بەرزە دەلالەتی هەڵچوونی ناوەوە لەخۆ دەگرێت. دواجار دەمەوێت بڵێم سەرەڕای ئەوەی کە لە رووی فۆنۆلۆژییەوە ئەو سروودە بە بێدەنگی کۆتایی نیوە دێرەکانی رادەگەیەنێت، بەڵام چەمکی بەیادهێنانەوەو چەمکی نیشتمان دوو چەمکن لە پێکهاتەی ئەو سروودەدا دەچنە خانەی شیعرییەتی جێگیرەوە.

ئەگەر (میدیا و کەیخوسرەو) چەمکی بەیادهێنانەوە لەخۆ بگرن و ئەو چەمکەش پێکوتین لە شوێن خۆ بگەیەنێت، ئەوە نیشتمان لە پەیوەندییەکانی ئەو سروودەدا چەمکی بەردەوامی و پێکەوە ژیانی لێدەسێنرێتەوە، بە سەندنەوەی چەمکی بەردەوامی و پێکەوە ژیان لە نیشتمان، هەم ژیان نابووت دەکەین و هەم نیشتمان دەکوژین، کەواتە لێرەوە شیعرییەتی جێگیر تەواوی مانا و دەلالەتەکانی ئەو سروودە هەڵدەمژێت و هەر لەوێشەوە جۆرێك لە دیکتاتۆرییەت پراکتیزە دەکات، کە من لێرە بە دیکتاتۆری نیگەران وەسفی دەکەم، چونکە سەرەڕای بێدەنگی رووکاری نەبزوێنەکان، چپە چپی پیتەکان و پەیوەندی خەفە ئامێزیان جگە لە نکۆڵی کردن، گومانیش دەگەیەنن، هەر لە رێگەی گومانی ئەوانیشە شیعرییەتی جێگیر بە دیکتاتۆی نیگەران دەچوێنم.

هەردوو نیوە دێری (٧-٨) دەبنە ئاماژەی دروستکردنی فەزایەك، بەڵام ئەو فەزایە فەزایەك نییە بۆ لێوردبوونەوە، بەڵکو فەزایەکە بۆ هەڵچوونێکی سۆزئامێز، بە دووبارەکردنەوەی ئەو دوو نیوە دێرە لە کۆتایی سروودەکە، ئەو هەڵچوونە سۆزئامێزە چڕتر بەرجەستە دەبێت، بەشێکی زۆری توندی ئەو هەڵچوونە سۆزئامێزە پەیوەندییەکی پتەوی بە پێکهاتە فۆنۆلۆژییەکەوە هەیە، بەڵام وەك گوتمان دواجار لە پیتی (ن) خاوبوونەوەی ئەو هەڵچوونە توندە دەبینرێت، ئەگەرچی خاوبوونەیەکی کت و پڕە، بەڵام وەك لە دەربڕینی دەنگییەوە دەبینرێت ، خاوبوونەوەیەکی چاوەڕوان کراویشە.

هەروەها هەردوو نیوە دێری (٧-٨) کە بە وشەی (کەس) دەسپێدەکاو بە وشەی (ئالآکەمان) کۆتایی دێت، لە ریتم خێرایەو وەك فۆنۆلۆژیاش وشەی (کەس) کە بە پیتی نەبزۆکی (ك)ی سەرەتایی دەسپێدەکاو بە نەبزوێنی (س)ی کۆتایی دوایی دێت، وشەیەکە جوانییەکەی لەرووی نمایشکردنی جەستەییەوە لە پیتی (ك)و (س)ەوە دەردەکەوێت. دەشێ بڵێین پیتی (ك) پیتێکە پڕە لە بزاڤی جەستەیی و لەنجەی سەرکێشانە، ئەگەرچی (ك)ی سەرەتایی بێدەنگە بەڵام جۆرێك لە بوێری تێدایەو سەر دانانوێنێت، هەمیشە لە رێگەی سەربەرزکردنەوە وەك جولەیەکی جەستەیی پێشڕەوی دەکات، پیتی (ك)ی سەرەتا وەك چیا سەرکەشە، هەروەها پیتی بێدەگی (س) پیتێکە ناسك و خانوومان و لوسە، جۆرێك لە چێژو فریودانی لەخۆدا هەڵگرتووە، ئەگەر دەستی تەوقە درێژ نەکات بەو نیو نیگایەوە بەرەو سیحری خۆی پەلکێشمان دەکات، ئیتر پیتی بزوێنی (ە) لە نێوان وێنەی چیاوو جولەی شەپۆلی دەریا هەر ئەوەندەی پێ دەمێنێت کە وەك خاڵی بەیەکگەیاندن و خاڵی پشکنین خۆی بنوێنێت، یان وەك ئەو چاوە بێت کە ئیرەیی پشتی تا ئەو پەڕی چەماندۆتەوە، بەو مانایە وشەی (کەس) دەشێ جوانترین وشەی نێو ئەو سرووودە بێت، بەڵام دوای ئەوەی کە بەر وشەی (نەڵێ) دەکەوێت، ئیتر هەست دەکەیت ئەو (کەس)ە چ وەك ماناو چ وەك جەستە دووچاری راوەدوونان دەبێتەوە، چونکە وەك گوتمان (ن) پیتێکی تا رادەیەکی زۆر پەرگیرەو کەمتر حەز بە تێکەڵبوون دەکات، بەڵام پیتی (ێ)ی کۆتایی، ئەو کۆتایەیە کە لە

لایەك هیچ ئەرزشێك بۆ وشەی (کەس) ناهێلێتەوە، لە لایەکی دیکە پیتێکی هێرش بەرو سادییە هەرگیز بیر لە دواوەی خۆی ناکاتەوەو هەمیشە خەریکی هێرش بردن‌و راوەدوونانی پێش خۆیەتی، دواجار دەتوانین بڵێین ئەو دوو نیوە دێرە هەموو جەخت کردنەکانی وشەی (زیندووە-ئالا...) لە پیتی (ن)ی کۆتایی قەتیس دەکات.

لە لایەکی دیکە وشەی (زیندووە) و (مردووە) دوو وشەی بەرجەستەی ئەو نیوە دێرەن، دەمەوێت بڵێم هەردوو وشەکە وەك ریتم هاوشانی یەکترن‌و ریتمێکی خێرایان هەیەو دوو وشەی کراوەن، بەڵام لە مانادا بە دژی یەکتر دەکەونەوە، لە لایەکی دیکە دەسپێکی وشەی (مردووە) بە پیتی نەبزوێنی (م) جۆرێك لە پێچاو پێچی‌و خۆ خواردنەوە دەگەیەنێت بەڵام پیتی بزوێنی (ە)ی کۆتایی ئەو خۆخواردنەوەیە دەشارێتەوە، ئەگەر ئەو پیتە نەبوایە ئەو وشەیە زێتر خۆی دەخواردەوە. کەچی وشەی (زیندووە) بە هۆی پیتی نەبزوێنی (ز)ی سەرەتا جۆرێك لە جوانی‌و شۆخ‌و شەنگی دەنوێنێت، بەڵام کۆتایی هاتنی ئەو وشەیە بە پیتی بزوێنی (ە) ئەو جوانکارییە تا ئەوپەڕی دەبات. ئەگەرچی وشەی (مردووە)و وشەی (زیندووە) لە زۆر باردا هەم تەواوکەری یەکترن‌و هەم دژ، بەڵام دواجار دەتوانین بڵێین وشەی (زیندووە) لە رووی رواڵەت‌و نەخش‌و جوانکاری‌و مانا‌و جولەو کرانەوە پێش وشەی (مردووە) دەکەوێت، بەو مانایەش وشەی (زیندووە) خۆی لە وشەی (مردووە) دەرکەوتووتر نیشان دەدات، دەشێ بەشێکی ئەو دەرکەوتنە لە رێگەی رواڵەت‌و

پەیوەندییەوە بە وشەی (کورد)ەوە بەند بێت، بەڵام نەك وەك داهێنان و بزاڤێکی گەورەی بەرجەستەو شەپۆلێکی گەورەی دەنگییەوە، بە مانایەکی دیکە نەك وەك زیندوویتی و دەرکەوتنێکی دەرەکییەوە، بەڵکو لە ڕێگەیەکی ناوەکییەوەیە کە ئێمە لەم خوێندنەوەیەدا بە جولەو وێنەو ڕواڵەتی شەپۆلی دەنگی هەر دوو پیتی بێدەنگی (ك)ی سەرەتاو (د)ی کۆتایی وشەی (کوردی)یەوە بەندی دەکەین، لێرەدا دەردەکەوێت کە زیندوویتی کوردی ئەوەندەی پەیوەندی بە بێدەنگی و چوونە ناوەوەی خۆیەوە هەیە، ئەوەندە پەیوەندی بە دەرکەوتنی دەرەکی و جولەی داهێنانەوە نییە.

دوو نیوە دێری (٩-١٠) وەك ریتم کەمێك خاو دێنەوە، دەشێ ئەو خاوبوونە جۆرە بیرکردنەوەیەك بێت، ڕەنگە ئەو بیرکردنەوەیە پەیوەندی بە وشەی (چەند)ەوە هەبێت، یان بە مانایەکی دیکە پەیوەندی بە چەمکی سەرسوڕمان و پرسیارەوە هەبێت، لێرەوە وشەی (چەند) دەمانخاتە بەر لێپرسینەوەو سەرسوڕمانەوە، بەڵام ئەو سەرسوڕمان و لێپرسینەوەیە لە وشەی (نەڕەشێر)دا دەگاتە نزمترین ئاستی ماناو چێژو نزمترین ئاستی جوانکارییەوە.

وشەی (چەند)ی دەسپێکی نیوە دێری (١٠) بەو هەموو ماناو جوانی و چێژەو بەو هەموو پرس و تێڕامانەیەوە دواجار لە وشەی (نەڕەشێر)دا دەکوژرێت، جوانی ئەو نیوە دێرە بە بڕوای من بە وشەی (چەند)و (لاوانی کورد)ەوە بەندە، وەك چۆن وشەی (هەزار) تەواوکەری وشەی (نەڕەشێر)ەو ئەو یەکتر

تەواوکردنەش پەیوەندی بە هەر دوو پیتی (ر)ی (هەزار)و (ر)ی (نەڕەشێر)ەوەیە، پیتی (ر)ی کۆتایی نیوە دێری (۹) ریتمی خۆی بە دەسپێکی بەیتی (۱۰) دەبەستێتەوە، کەواتە ئەگەر وشەی (بوون) نەبێت ئەو سرووده بە هیچ شێوەیەك نابێتە خاوەنی ریتمی نیوە دێری (۹)، یان بە مانایەکی دیکە ریتمی ئەو نیوە دێرە (با) دەیبات، تەواوی پەیوەندییەکانی بەو سرووده لە دەست دەدات، کەواتە (بوون) ئەو وشەیەیە کە وەك ریتم و مانا ئەو دوو نیوە دێرە بە یەکەوە دەبەستێتەوە، ئەگەر وەك ریتم ئەو بە یەك بەستنەوەیە پەیوەندی بە پیتی (ن)ی کۆتایی وشەی (بوون)ەوە هەبێت، وەك مانا پەیوەندی بە وشەی (نێژران)ەوە دەکات، لە نێوان وشەی (بوون)ی دەسپێکی نیوە دێری (۱۰)و وشەی (نێژران)ی کۆتایی ئەو نیوە دێرە وشەی (قوربانی) کۆی مەبەستەکان لەخۆ دەگرێت، بەمجۆرە لە نێوان (نەڕەشێر)و (قوربانی) دەشێ نێودژییەك بدۆزینەوە، ئەو نێودژییە، نێودژی پیتی (ر)ی کۆتایی (نەڕەشێر)و (ر)ی ناوەڕاستی وشەی (قوربانی)یە، دەمەوێت بڵێم ئەو پیتە نەبزوێنەی کۆتایی لە وشەی (نەڕەشێر) تەواو سەرگەردانە، بەڵام لە وشەی (قوربانی) هەڵگری نەرمی و جوانیەکە، ئەو نەرمی و جوانییە پەیوەندی بە راگرتنی ئەو هاوسەنگییەدایە کە دەکەوێتە نێوان دوو بڕگەی (قو-بانی) هەر لەوێشەوە نێودژی ئەو دوو وشەیەمان بۆ دەردەکەوێت، بەڵام لە رووی ماناوە نێودژی (نەڕەشێر)و (قوربانی) دەکەوێتە نێوان وشەی (چەند)ی دەسپێك و وشەی (نێژران)ی کۆتاییەوە، لێرە پرسیار ئەوەیە:- چەند نەڕەشێر

بوونە قوربانی، یان چەند نەڕەشێر نێژران؟ چەند کورد بوونە قوربانی، یان چەند کورد نێژران؟!.

بەڵام لە نیوە دێری (١١-١٢) ماوەی نێوان دەسپێکی نیوە دێری (١١) کە وشەی (لاوی کورد)ەو کۆتای ئەو نیوە دێرە کە وشەی (دلێر)ە لەوێ پیتی (ر) ئەو پیتەیە کە لاوی کورد ون دەکات، ئەوەی کە لەو ونبوونەش جێدەمێنێت (خوێن)ە، وشەی (خوێن) وشەیەکە لەو سروودەدا لە بری مەرەکەب و بۆیە نەخشی پێ دەسپێردرێت، بە لایەکی دیکەش ڕەنگدانەوەی ریتمی ئەو نیوە دێرە دەکەوێتە سەر وشەی (خوێن)، خوێن نەك هەر وەك بۆیە نەخشی پێ دەکرێت، بەڵکو ئیقاعی ناوەوەی ئەو دوو نیوە دێرەشی تێدا ڕەنگدەداتەوە، لێرەدا خوێن چ تاجی ژیان بنەخشێنێت، چ هەڵچوونی ریتمی ترس پڕ بکاتەوە تەنها یەك شتمان پێدەڵێت ئەویش قوربانییە.

کەواتە لەم سروودەدا لاوی کورد ئەو قوربانیەیە کە بە نەڕەشێر دەچوێنرێت، ئەو بەیەکچواندنەش کە دواجار لە خوێندا خەڵتانە، یەکێکە لە مەدلولە سادییەکانی ئەو سرووده، بەو مانایە لە پشت ئەو مەدلولە سادییە (من)ێکی سادی وەستاوەو هەر ئەو منە سادییە پەرگیرەیە کە لە پشت چەمکی نیشتمان و چەمکی بەیادهێنانەوە، بیر لە بێ نرخکردنی ئەویدیکە و بێ نرخکردنی بە یەکەوەژیان دەکاتەوە.

## باسی چوارەم

### ئامادەیی شۆڕشگێرانەو نائامادەیی هونەری

(دڵدار)ی شاعیر لە ساڵی ١٩٣٨ دەچێتە پاڵ حیزبی هیوا، بە هۆی زرنگی و لێهاتوویییەوە لە ماوەیەکی کەمدا دەبێتە سکرتێری ئەو حیزبە[٦٥].

ئەو رستەیەم بۆ ئەوە وەرگرت کە بڵێم لە لایەك سروودی (ئەی رەقیب) لەو ماوەیەدا نووسراوە، واتە مێژووی نووسینی وەك پێویست دیار نییەو زێتر لەگەڵ ئەو شیعرانە دێن کە لە شاری کەرکوك و بەر لە ساڵی ١٩٤٠ نووسراون، پێش ئەوەی کە قۆناغی سانەوییە تەواو بکات، لەلایەکی دیکەش دەمەوێت وەك بنەڕەتێك بۆ بەدواداچوونی دەق کەڵکی لێوەرگرم و لەوێشەوە ئاماژ بە واقیع و ژیانی خودی شاعیر بکەم.

کەواتە ئەگەر بۆ رستەی ناوبراو بگەڕێینەوە کەمەکێك لە پرۆسەی نووسینی نزیك بکەینەوە، دەشێ بەشێکی زۆری ئەو قەسیدەیە بە سەردەمی گەنجی کەف و کوڵی هەستی گەنجییەوە پەیوەست بکەین، وەك چۆن دەکرێت بەشێکی بە ناوەوەی (دڵدار) ببەستینەوە.

وەك گوتمان ئەوەی لێرە کە لە دەقی (ئەی رەقیب) راستەوخۆ دەیبینین و زۆر بە جوانی هەستی پێدەکەین ئەوەیە کە بەر

---

[65]. بڕوانە: دڵدار شاعیری شۆڕشگێری کورد/ل٨٨.

لەوەی (ئەی رەقیب) وەك جەستەی شیعر خۆی لەبەردەم خوێنەر بكاتەوە، وەك جەستەی میللەتێك دەردەكەوێت، لە نێوان جەستەی شیعرو جەستەی میللەت دوو جیاوازی سەرەكی هەیە، یەكەمیان پەیوەندی بە (واقیع) دایەو دووەمیان پەیوەندی بە (خەیاڵ) دایە، نەك بەو مانایەی كە بشێت لە تویێی خەیاڵدا جەستە دەركەوێت، بەڵكو بەو مانایەی كە بەشێكی زۆری جەستەی شیعری پەیوەندی بە خەیاڵو وێناكردنی خەیاڵەوە هەیە، یەكەمیان رەهەندی مانای لەخۆدا هەڵگرتووەو ئەویدیكە رەهەندی چێژ، رەهەندی ماناش لە سەر دوو شێوە كاركردن خۆی دەنوێنێت، یەكەمیان لە مانای بەرهەمهاتوو پێكهاتووە، واتە شاعیر لەنێو مانای بەرهەمهاتوو كار دەكات، ئەوی دیكە لەسەر بەرهەمهێنانی مانا وەستاوە، بەڵام رەهەندی چێژ بە ناوكۆیی دەقو پەیوەندی ناوەوەی دەقەوە بەندە.

(دڵدار)ی شاعیر لە نووسینێكدا بە ناونیشانی (ئەدەب بە خواری تەماشا دەكرێت) دەڵێت: ئەدەب زۆر لە تیشكی رۆژ دەكات، كە تیشكی رۆژ بە تایبەتی چ رەنگێكی مەعلوم نییە، بەڵكو لەچەند رەنگێكی زانراوەوە پێكهاتووە، ئەو رەنگە زانراوانەش تا تیشكی رۆژ نەدەیتە بەر بەللور بۆمان دەرناكەوێت.

جوانی ئەو رستەیە وەك پرۆسەی نووسینی بەرهەمی ئەدەبی لە بە یەكچوانی ئەدەب بە تیشك خۆی هەڵدەگرێتەوە، بەڵام بەیەكچواندنی ئەدەب بە تیشكی خۆر لەلایەك جۆرێك لە سەرچاوەداری وێنا دەكات، لەلایەكی دیكە فرە لقی ئەدەبی

دەسنیشان دەکات، ئەگەر بۆ تیشکی رۆژ خودی رۆژ سەرچاوە بێت، ئەوە بۆ ئەدەب نووسەر دەبێتە سەرچاوە، کەواتە ئەگەر بەللور بۆ رەنگی زانراوی خۆر بنەما بێت، ئەوە دەشێ بۆ نووسەر پەیوەندی بە کەلتورەوە بکەین.

دەشێ لەو راڤەکردنەی سەرەوە بەشێکی زۆری مەبەستی (دڵدار)مان پێکابێت، بەلاَم روویەکی دیکەی ئەو رستەیە پەیوەندی بە پرشنگی خۆرو پرشنگی نووسینەوە هەیە، بەو مانایەش تیشك دەبێتە هەڵگری جوانی فرە مانایی، یان لەوێوە جوانییە کە درەوشانەوە جیاوازیگەلێکی لەخۆدا هەڵگرتووە، بەلاَم ئەو رستەیەی (دڵدار) لەوێوە دووچاری بنبەستبوون دێت کە نامەعلوم بە مەعلوم دەگەیەنێت، ئەو بەیەکگەیاندنە دواجار تەواوی راڤەکانێ دەکوژێت، وەك چۆن لە سنوورێکی دیاریکراو خۆی قەتیس دەکات، بەو مانایەش بیرورای (دڵدار) دەکەوێتە دوتوێی سنوورەکانەوەو ناتوانێت تەجاوزیان بکاتو تێکیانبشکێنێت.

کەواتە دەشێ لە سەر ئەو بنەمایە کارکردنی (دڵدار) لە سروودی (ئەی رەقیب) بە کارکردن لە نێو مانای بەرهەمهاتوو بچوێنین، بەو مانایەش هەڵوێستی (دڵدار) لەگەڵ زانراوەکانو ئامارژە بۆکراوەکان یەکدەگرێتەوە، ئەو یەکگرتنەوەیە وەك چۆن رەهەندەکانی مانا دووچاری بنبەستبوون دەکات، بە دیووەکەی دیکەش پرسیار لەناو دەبات، وەك چۆن هەنگاونان بەرەو نادیار دووچاری بنبەستبوون دەکات، بە هەمان شێوەش جوانی دەسرێتەوە، لێرەدا دەکرێت سنوورەکانی هەڵوێستی (دڵدار) بە

واقیعو ئامـاژە بۆکراوەکـان پەیوەسـت بکـەین، کـاتێکیش واقیـع سنوورەکانی نووسین دیاری دەکات ئیتر زمان دەبێتە وەسیلەیەك بۆ گەیاندن. (ئیمبرتۆ ئیکۆ) دەڵێت: ئەوەی لە قەسیدە بەگرنگ دەکەوێتـەوە هەڵوێسـتی شـاعیرو خوێنـەر نییـە بەرامبـەر واقیـع، بـەڵکو هەڵوێسـتی شـاعیرە بەرامبـەر بـە زمـان، ئـەو زمانـەی کـە خوێنـەر هوشـیار دەکاتـەوەو لەوێشـەوە خوێنـەر وەك هۆیـەك بـۆ گەیاندن بەکاری دەهێنێتو دەتوانێت لە نوێوە سەیری بونیـادی زمانەکەو بونیادی دنیای پێ بکات[٦٦]. بەو مانایەش شیعر لەگەڵ ئاماژە بۆکراوەکان یەکناگرێتەوە، بەڵکو بەردەوام بەرەو پرسیار راماندەکێشێت کە لەگەڵ پرسیارێکی دیکە دایە.

دەتوانین بڵێین (ئەی رەقیب) وەك (شێوەی دارِشتن-پەیکـەر)و وەك (مانا-بابەت) لەیەکدەچن، یان جیاوازیان نییە، بە مانایـەکی دیکە بە قەد ئەوەی زمانی جەستەی (ئەی رەقیب) لە بەرژەوەندی ئاماژە بۆ کردنی جەستەی میللەت دایە، ئەوەنـدە لـە بەرژەوەنـدی شیعرییەت وزەکانی زمان بە کار ناخـات، بـۆ ئـەو بۆچوونەشمان پشـــت بـــە دوو لایـــەنی (مانـــا)و (پەیکـــەر) دەبەســـتین، ئـــەو پشتبەسـتنەش لـەوێوە دێـت کـە سـروودی (ئـەی رەقیـب) وەك پەیکەر-شێوەی دارِشتن هـەڵگری جەسـتەیەکی سـەختو توونـدو تۆڵـەو تـا ئەندازەیـەکی زۆر خـاوەنی شـورەیەکی داخـراوە، لـە بەرامبـــەر ئـــەوەش وەك مانـــا-بابـــەت هـــەڵگری چاونەترســـیو ئازاییو سەرفرازیی میللەتی کوردە.

---

[66]. جان کوهین، البنیة اللغة الشعریة-ل ٦٥.

لە سەر ئەو بنەمایە ئەگەر جەستەی (ئەی رەقیب) وەك (پەیکەر)جەستەیەکی داخراو بێت، یان شێوەیەکی داخراو بنوێنێت ئەوە وەك ماناش ((دڵدار)) لەبری ئەوەی مانا بەرهەم بهێنێت لە سەر مانای بەرهەمهاتوو وەستاوە، یان لەبری ئەوەی وزەی زمان لە پێناو شیعرییەت کار پێبکات، لە ئاماژە بۆ کردنی واقیع کورتی دەکاتەوە، دەشێ بڵێین دواجار هەر ئەو رووەی ماناشە لە بونیادی پەیکەری دەق رەنگدەداتەوەو وێنەی پەیکەری دەق بەو شێوەیەی کە هەیە دەکێشێت. لێرەوە ئەگەر بمانەوێت بۆ مانای بەرهەمهاتوو پەیوەندی بە دەقەوە بکەین دەشێ دەستەواژەی (ئەی رەقیب) لە دەسپێکدا بێتە سەرەتایەکی بەڵگە نەویست وەك چۆن دەستەواژە پەرگیرو تۆتالیتێرەکانی دیکەی وەك (زیندووە–زیندووە) (قەت نامرێ) (جانفیدایە جانفیدایە)... دەتوانین هەموو ئەو دەستەواژانە لەلایەك بە (ئەمرکردن)ەوە پەیوەست بکەین، هەڵبەتە ئەمرکردن ئەگەر لەلایەك بیرکردنەوەیەکی باوکانەو تۆتۆلۆژیانە بێتو لەوێوە تەواوی رەهەندەکانی مانا لە نێو بەرێت ئەوە لە لایەکی دیکە بیرکردنەوەیەکی پەرگیرانەشەو کوشتنی جیاوازییەکانی لەخۆدا هەڵگرتووە، بۆیە بەشێکی زۆری جوانی دەقو جوانی ژیان سەردەبڕێت، وەك چۆن دەشێ خودی ئەو تۆتالیتیەو توونودو تیژییە لە ناوەوەی دەقو پەیکەری دەق بە شێوەی داڕشتنو وێنەکردنەوە پەیوەستی بکەین، بە دیووەکەی دیکەش دەکرێت لە دەرەوەی دەق بە قۆناغی منداڵی شاعیرەوە بیبەستینەوە، شاعیر لە یادەوەریەکانیدا دەنووسێت: دایکم

نەیهێشت بچمە کۆلاّن و لەگەڵ منداڵان یاری بکەم بۆ ئەوەی کە لە ماڵەوە عاجز نەبم دایکم ئافرەتێکی بە خێو دەکرد دوو کوڕی پارچەڵەی هەبوو یەکیان ناوی (خدر) بوو ئەویتریان ناوی (عەزین) بوو، ئەو دوو کوڕە لە حەوشەدا یارییان لەگەڵدا دەکردم ئەغلەب یاریمان عیبارەت بوو لە تەمسیلی ئاغاو نۆکەر، منیان دەکردە (ئاغا)و خۆشیان دەبوون بە (نۆکەر) ئیتر ئەمرم دەکرد[٦٧] . هەڵبەتە ئەو فیکرەیە بۆ تەمەنی دوای چوار ساڵی دەگەڕێتەوە.

کەواتە ئەگەرچی ماناکان هەڵگری دەلالەتن بەلاّم دەتوانین دەلالەتەکان لە نێو واقیع بدۆزینەوە، یان بە رووەکەی دیکە دەتوانین خولیای ناسیونالانە لە میانی دەلالەتەکانەوە هەڵبگرینەوە، هەر لەوێشەوە وەسف و رووە جیاوازەکانی مانا دووچاری داخران دەبێت، داخرانی رووەکانی ماناش راستەوخۆ بۆ شێوازی بابەت دەگەڕێتەوە، شێواز وەك (بۆفۆن) دەڵێت خودی مرۆڤ خۆیەتی. بەو مانایەی کە هەموو داهێنەرێك شێوازی تایبەت بەخۆی دادەهێنێت، شێواز پرۆسەگەلێکی عەقڵی و فیکری و رۆشنبیرییە بە تواناو ناسین و رێگەی دەست بۆبردنی زمانەوە بەندە–[٦٨] .

بە مانایەکی دیکە لە کاتێکدا کە مانا هەوڵی بەرجەستەکردن و جوانکردنی یەك رووی بابەت دەدات، لەو

---

[67]- بڕوانە دلّدار– هـ.س.پ. ل.١٧.

[68]. بڕوانە: حاتم شرتح/ <u>الانزياح و الشعرية في النظرية النقدية و الاسلوبية الحديثة</u>، پێگەی گوگوڵ.

کاتەدا بابەتخوازی دەبێتە تاکە رەهەندی دیارو بەرچاوی دەق، لەو حاڵەتەشدا مانا هەموو رووەکانی دیکەی خۆی لەناو دەبات، سەرەڕای ئەوەش ((دڵدار)) نەیتوانیووە بە شێوەیەکی نەرم مامەڵە لەگەڵ مانادا بکاتو مانا بدوێنێت، بڕوانە ئەو توونڈو تیژییەی کە دەق بەرامبەر ئەویدیکە دەینوێنێت. ئەوەش لەلایەك جۆرێك لە ئیشکالییەتی هونەریو پشتگوێخستنی وزەی زمانو خەیاڵو جوانی زمانە، لە لایەکی دیکە کارکردن لە نێو مانای بەرهەمهاتوو، هەرگیز کارکردن نییە لە نێو پرسو گومانو دڵەڕاوکێی مەعریفی، بەڵکو کارکردنە لە نێو دنیابینی بەرهەمهاتوو، کەواتە (ئەی رەقیب) لە جولەو جوانکاری ناوکۆییەوە لە دایك نەبووە، لە گەڕان وپرسو گومان هەڵنەقولاوە، بەڵکو لە پرۆسیسەکردنی جۆرێك لە ئەخلاق دێت، کە هەستی نەتەوایەتی دەیخاتە پێش (ئەی رەقیب) وەك جەستەیەکی ئامادەکراو هەستی نەتەوایەتی دروستی کردووە.

لێرەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بەر لەوەی ((دڵدار)) بە کردەی شیعری هەڵبسێت بیری لە جەستەی میللەت کردۆتەوە، بەر لەوەی ئاڵای شیعرییەت بەرز بکاتەوە، ئاڵای ناسیونالییەت هەڵدەکات، کەواتە لای (دڵدار) شیعر پەیوەندی نێوان شاعیرو نەتەوەیە، نەك پەیوەندی ناپەیوەستیانەی نێوان وشەو شتەکان، مرۆڤو دنیا، کە وشەی ناپەیوەست بەکار دەبەین بەو مانایە دێت کە پەیوەندییەکان نە شیعر دەیسەپێنێت نە شاعیر بەڵکو را، تەخۆ بە ساتەوەختی پرۆسەی نووسینی شیعرەوە بەندە،

دەکەوێتــە دوتــوێی پرۆسیســـەکردنێکی هونـــەری و خـــەیاڵی ئیستێتیکییەوە.

بە مانایەکی دیکەش دەشێ لە بری وشەی (سەپاندن) وشەی نزیکایـەتی بـەکار بـەرین، ئەگـەر وشـەی نزیکایـەتی بـەکار بـەرین ئەوە لە بری بەکار هێنانی پەیوەندی ناپەیوەستانە، دەتوانین بە نزیکایـەتیکردنی نهێنی وشەکان و شتەکان، نهێنی مرۆڤ و دنیا تەعبیر لە رستەی پێشوو بکەین.

لێـرەدا دەگەینــە ئــەوەی کــە پەیوەنــدی ناپەیوەسـتانە یــان نزیکایـــەتیکردنی نێـــوان وشـــەکان و شـــتەکان، مـــرۆڤ و دنیـــا، پەیوەندیەکی گوماناوی و نادیارە بە جیاوازی خوێندنەوەکانەوە بەنـــدە، جیـــاوازی خوێندنـــەوەکانیش بـــە دنیـــابینی و ئاگـــایی خوێنەرەکانەوە دەلکێت. بەو مانایەش کوشتنی وەسف و رووە جیاوازەکـــان لەلایـــەك داخرانـــی رەهەنـــدەکانی بیرکردنـــەوەو دڵـەڕاوکێی مـەعریفی لـەخۆدا هـەڵگرتووە، لـە لایـەکی دیکـە کوشـتنی جـوانی و شـیعرییەتی لێدەبێتـەوە، لـەنێوانی کوشـتنی جـوانی داخرانـی رووە جیاوازەکـان سـروودی (ئـەی رەقیـب) لـە لایەك دەبێتە هـەڵگری ویـژدانی میللـەت، لـە لایـەکی دیکـە دەبێتـە هەڵگری جەستەی داخراوی دەق.

ئەگەر هەڵگری ویژدانی میللەت بە بیرکردنەوەی ناسیونالیانە پەیوەسـت بکـەین، ئـەوە هـەڵگری جەسـتەی دەق بـە داخـران و داخرانی پەیوەندییەکانی ناوەوەی دەقەوە بەندە. مەبەستمە بڵێم ((دڵدار)) لە بری ئەوەی هەڵوێستی خۆی لە بەرامبەر زمان دیاری بکات، راستەوخۆ لە واقیع راستدەبێتەوە، لە بری ئەوەی بەرەو

هونـەر بچێت لـە ئاكاردا كورتی دەكاتـەوە، كاتێك ویـژدان بـەرەو واقیع دەچێت چێژی شیعری بوونی نامێنێت، كاتێكیش بـەرەو ئاكـار دەچـێت هەسـتی دەروونـی رقمـان نیشـان دەدات، كەواتـە ویژدانی كوردانەی (دڵدار) یان هەستی ئاكارخوازانەی (دڵدار) لـە رووە دیارەكەی سروودی (ئەی رەقیب) تووندو تیژی، یـان رقێكـە بەرامبـــەر رەقیـــب، ئـــەو رقـــەش لـــە حـــەزو ئـــارەزووە ناسیونالیستەكەیەوە هەڵدەقوڵێت.

لێرەوە خوێنـەر لـە خوێندنـەوەی ئەو دەقـە دەكەوێتـە نێوان ئامــادەیی شۆڕشــگێڕانەو نائامــادەیی هونەرییــەوە، ئەگــەر ئامــادەیی شۆڕشــگێرانە راســتەخۆ لەدەركــەوتنی دەســەڵاتی بابەتــەوە بێــت، ئــەوە نائامـادەیی هونــەریی لــە دەرنەكــەوتنی دەسـەڵاتی ئیسـتێتیكییەوە خـۆی دەبینێتـەوە، یـان بە مانایـەكی دیكە ئەگەر دەركەوتنی بابەت خۆی بە عەقڵەوە پەیوەست بكـات، حالەتێكی دیار بخاتەوە ، ئەوە دەرنەكەوتنی هونەری لە لایەك بە داخرانــی ئاســۆكانی جەســتەی شــیعرەوە بەنــدەو لــە لایــەكی دیكەش نەیتوانیوە حاڵەتە نادیارەكە بكێشێت.

ئەوەی ئامادەیی دەركەوتنی بابەت بەرجەستە دەكات مانایە، ئەوەی كە جیاوازی نێوان ماناكانیش رەشدەكاتەوە لێكچوونە، ئـەو لێكچوونەی كـە دەكەوێتـە نێوان جەستەی دەق و جەستەی میللـەت، یـان ئـەو لێكچـوونەی كـە دەكەوێتـە نێـوان تۆكمـەیی پەیكەری داخراوی دەق و تۆكمەیی تاك مانابییەوە.

بەڵام ((كانت)) وای دەبینی كە ئیستێتیكا بـەو خەسڵەتانەوە دەنازێــت كــە دەكەوێتــە نێــوان دەســەڵاتی عــەقڵ و دەســەڵاتی

سروشـــتی. دەســـەڵاتی ئیســـتێتیکا لـــە چـــێژەوە هەڵـــدەقوڵێت، چـــێژیش لـــە رازیبوونێکەوەیـــە کـــە پشـــت بـــە ســـوودمەندی نابەستێت، واتە چێژی هونەری گرنگی بە راستی بابەت نادات، ئـەوەش پێچـەوانەی چـێژی هەسـتییە، کـە داوای خاوەنـدارێتی دەکات، بە پێچەوانەی رازیبوونی سروشت کە داوای سەپاندنی بابەتەکەی دەکات، بۆ نموونە نیگارکێش بە ((میوە)) یان وێنـەی میوە سەرسام دەبێـت، بەڵام رەنگە ئارەزووی خـواردنی نـەکات، یـان وەك هونەرمەنـدێك ئـارەزووی فرۆشـتنی نـەکات، ئیسـتێتیکا ناکەوێتــە دوتــوێی ســوودمەندیەوە، بــەڵکو وەك ئــەو سروشــتە رووتـە تەماشـا دەکرێـت کـە چـێژ دەبەخشـێت، بـێ ئـەوەی هـیچ سوودێك بگەیەنێت، بەو مانایەش ئەدەب تەنها بۆ چێژ وەرگرتنـە لە جوانی، نەك بۆ ئامارژە کردن بە چاوگە دەرەکیەکان[٦٩].

کەواتـە ئەگـەر بمانـەوێت لـەو سـروودەدا بـەدوای دەرکـەوتنی مانا-بابەتدا بڕۆین بەشێکی زۆری شیعرییەت لەدەست دەدەیـن، چـونکە شـیعر هـەر تـەنها تـەعبیرکردن نییـە، یـان راڤـەکردنی واقیعێکـی دیـاریکراو نییـە، بـەڵکو نهێنی شـیعر لـە مەجازەدایـە، زمانی مەجازیش زمانی سیحرەو هـەتا هەتایـە وێنـەکانی نوێیـەو زۆرترین مانا بەکەمترین واژە دەگەیەنێت، لە مەجازدا (دیار) قسـە ناکات، بـەڵکو (نادیـارە) دێتـە گـۆ، یـان بـە مانایـەکی دیکـە زمـانی

---

69. محمد غنيمي هلال: النقد الادبي الحديث, دار العودة- بيروت- ١٩٧٢,ل٣٠٠).

مەجازی ئەوەیە کە گومان دەخاتەوە، شیعریش لەوێوە سیحرە کە مەجاز لە رێگەی وێنەو رەمزەوە دنیا راڤە دەکاتەوە هەر لەوێشەوە دەچێتە فەزای خەیاڵو ئازادییەوە، خەیاڵیش بە چاوی خەیاڵەوە درك دەکرێت، نەك هەست، ئازادی شیعریش لەوێوە دێت کە سەرسامبوون دەست پێدەکات، ئازادی شیعری بە روانینی ئازادانەوە بەندە، نەك حوکمی عەقڵ.. بەڵام ئەگەر بە دوای هەستی ناسیونالیانە بکەوین بە ئامانجێکەوە پەیوەست دەبین کە بەرەو سیاسەتو شتی دیکەمان دەبات، بەمجۆرەش وەك ئەدۆنیس دەڵێت: بە هۆی وەزیفەکەی لە مردن نزیك دەبێتەوە چونکە بە پێی چالاکی وەزیفەکەی مامەڵە دەکات–[٧٠].

---

[70]. برِوانە: ادونيس/ النص القراني و افاق الكتابة– دار الاداب– بيروت/١٩٩٣ ل١١٤).

ئەنجام:-

١-ئـەی ڕەقیـب سـروودێکە، کـە دڵـداری شـاعیری بـە هـەموو کوردسـتان ناسـاند، خـودی ئـەو سـرووده لـە دوتـوێی زمانـە ڕەمزییەکەیـدا تـەعبیر لـە بەسـەرهاتی خوێنـاوی میللـەتی کـورد دەکات، بەڵام لە ڕووە نادیارەکەی تـەعبیر لـە هەستی چەپێنراوی خودی شاعیر دەکات.

شـاعیر لـە ڕووە دیارەکەیـەوە لـە بـری میللـەتێك دێتـە گـۆو ڕەسـەنایەتی خـەبات و کۆڵنـەدان و سـەرکەوتنەکانی کـورد بـە ناحەزان ڕادەگەیەنێت، هەروەها توانیوویەتی ڕۆشنبیرییەك وێنە بکـات، کـە کۆمەڵگـە لـە کۆدەکانیـدا بەشـدارە، هـەر لەوێشـەوە جۆرێـك لـە سـێنترالیەت بۆخـۆی دەسـازێنێت. بـەڵام لـە ڕووە نادیارەکـەی لـە بۆشـاییەکانی نێـوان دەنـگ و دەنگدانـەوە، نێـوان هەڵچـوون و بێدەنگیـدا وسـبەلێکراوەکانی خـۆی شـاردۆتەوە. کەواتە ئەوەی ئەی ڕەقیـب بەرجەستە دەکات خرۆشـانی هەسـتی نەتەوایەتیـە و تـەعبیری کـۆی هـەڵگرتووە، نـەك چـەپێنراوەکانی نەستی شاعیرو دەربڕینی داهێنەرانەی تاك.

٢- هـیچ کارێـك کـە لـە زمـان دێتـە بەرهـەم داخـراو نییـە، وەك چـۆن هـیچ دەقێـك نییـە هـەموو ئـەوەمان پێبڵێـت کـە دەیـەوێت. کەواتە ئەی ڕەقیب لەوێوە داخـراو نییـە، کـە زمـان هـەڵگری مانـاو دەلالەت و مێژوو و یادەوەری و خەیاڵی خۆیەتی.

٣-لە نێوان بێدەنگی دڵدارو نەستی دڵدار وەك تاك لـە لایـەك و هەسـتی خۆشـی خوێنـەری ناسـیونال و هەسـتی دژ بوونـەوەی خوێنـەرانی دیکـە، مـەرجی بەیەکـەوە هـەڵکردن مـەحاڵ

دەکەوێتەوە، ئەوەش ئەوەمان پێدەڵێت کە ئەی رەقیب بە قەد ئەوەی هەڵگری پەرگیرییە، داهێنان نییە چونکە پرسی ئیبداع‌و پرسی ئازادی بیروڕاو پرسی خەڵقکردن ...هتد بە گشتی مەرجی بە یەکەوە هەڵکردن دەنوێنێ.

٤-ئەی رەقیب ئەوەندەی خەمی گەیاندنی تیا بەرجەستەیە، ئەوەندە بەرەو شیعرییەت هەنگاو نانێت. لێرەدا ژیانی ئەو دەقە دەبێتە ئاوێنەی قۆناغێکی دیاریکراوی دەلالەت‌و ژانوژوارەکانی کۆمەڵگە، وەك چۆن کۆمەڵگەش بۆ هەمان قۆناغی دیاریکراو دەبێتە ئاوێنەی دەقی ناوبراو، هەر لەو هەستەشەوە بۆ ئەویدیکەی جیاوازو ناکوردیو بۆ نەستی شاعیر هەستی گرژبوونەوە دنە دەدات، ئەوەش خاڵی سێیەممان تۆختر نیشان دەدات.

٥-لە ئەی رەقیبدا فیکری ئایدیۆلۆژیو سیاسی دەبێتە تاکە تەوەرەی دەسەڵات‌و دەبێتە تاکە مەبەستی دیاریکراو، هەر لەوێشەوە بە شێکی زۆری ئەی رەقیب دەکەوێتە دەرەوەی فیکری مەعریفیو ئەدەبییەوە، هەروەها زمان لە میانی فیکری ئایدیۆلۆژیو سیاسیدا تەنیا گرنگی بە تاکە مەدلولێك دەدات‌و هۆشی خوێنەری پێ کۆنترۆڵ دەکات، ئەو کردارەش بە هەموو مانایەکەوە داماڵینی زمانە لە بەهای مەعریفیو رۆشنبیریو نەستیو ئیستێتیکیەکان‌و کوشتنی دالە لە چوارچێوەی تاکە مەدلولێکی ئایدیۆلۆژیو سیاسییانەوە.

## سەرچاوەکان:

### کتێبە کوردییەکان:

* ئەدۆنیس ، کفتوکۆ لەگەڵ ئەدۆنیس- و: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد/ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

* علائەدین،ع، دڵدار شاعیری شۆڕشگێری کورد، چاپی یەکەم بغداد-١٩٨٥.

* دیاینی،ر، دەچن، دا، ئەبرامز، رێبازەکانی رەخنەیی ئەدەبی، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: عەتا قەداغی، لە بلاّوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.

* عەبدوڵلاّ،ع، ئاگایی زمان زمانی ئاگایی- چاپ و پەخشی سەردەم چاپی یەکەم، سلێمانی- ١٩٩٩.

* فەللاح، ك، کاروانی شیعری نوێی کوردی بەرگی یەکەم - بەغداد ١٩٧٨

### کتێبە عەرەبییەکان:

* ادونيس، النص القراني و افاق الكتابة- دار الاداب- بيروت، ط=١، ١٩٩٣.

* ابو زيد، ن، اشكالية القراء ة و التاويل- المركز الثقافي العربي- الفصل الاول، ط٤-١٩٩٦ .

* السيد، ع، الابداع و الشخصية، دار المعارف/ القاهرة، ط،١٩٧١

* تـــودوروف، ت -نقـــد النقـــد- ترجمـــة:- د. ســـامي سويدان/مراجعة: د.ليليان سويدان، بغداد،ط ١٩٨٦.

* راي، و، المعـــني الادبـــي مـــن الضـــاهيراتية الى التفكيكيـــة، ترجمـــة:- د. يوئيـــل يوســـف عزيـــز_دار المـــامون للترجمـــة و النشر،ط١، بغداد، ١٩٨٧.

* سوكولوف، ي، الفولكلور قظايا و تاريخة/ ترجمة:- حلمي شـعراوي- عبدالحميـد حـواس، مراجعـة، الـدكتور: عبدالحميـد يونس.الهيئة المصرية العامة للتاليف و النشر ط/١٩٧١

* صـالح، د، نظريـة التلقـي اصـول و تطبيقـات، ط١ بغـداد (١٩٩٩).

* كـوهين، ج، بنيـة اللغـة الشـعرية، ترجمـة:- محمـد الـولي ومحمد العمري، المغرب، ط ١٩٨٦ .

* كريســـتيفا، ج ، علـــم الـــنص- ترجمـــة:- فريـــد الزاهـــي، مراجعة: عبدالجليل ناظم-دار توبقال للنشر.

*مجاهد عبدالمنعم، م، علم الجمـال في الفلسـفة المعاصـر، عـالم الكتب- بيروت، ط٣،١٩٨٦.

* محمود، ا، جماليات الصـمت في اصـل المخفـي و المكبـوت- مركز انماء الحضاري-ديمشق/ط٢٠٠٢،١.

* ياوس, هـ، جمالية التلقـي-من اجل تـاء ويـل جديـد للـنص الادبي، ترجمة:- رشيد بنحدو، القاهرة،ط١، ٢٠٠٤.

* هيغـــل, فكـــرة الجمـــال، ترجمـــة: جـــورج طرابيشـــي، دار الطليعة- بيروت،ط١.١٩٧٨.

**گۆڤاره کوردییەکان**

* رۆلان بارت/ مەرگی نووسەر- گۆڤاری سەراب/ژ(٣-٤)، و: ئازاد بەرزنجی.

**گۆڤارەعەرەبییەکان:**

* ابو شهاب، ر، اللغة الحافز و المؤثر، مجلة الجسور-٢٠٠٤. دەتوانیـــت لـــە ئینتـــەرنێت لـــەم پێگەیـــە ســـەیری بکـــەیت:
www.arabicstory.net

* القـاسمي، م، القـراء ة و التـاويـل في النقـد الادبـي الحـديث، مجلة (فكر و النقد) العدد (٦٧) المغرب.

* توفيـق، س (هرمينوتيكـا الادبـي بـين هيـدجر و جـادامير) مجلة (النزوى) العدد (٢) تصدر عن موسسة (عمان) للصحافة و الانباء و النشر و الاعلان.

* خرماش، م، النص الادبي و اشكالية القراء ة و التـاء ويـل، مجلة/ فكر و النقد المغربي- العدد ٢٠٠٥،٦٧.

* ريكور، ب، الشعر والإمكان - مجلة (نـزوى) العدد (١٥) ص www.nizwa.com/volume15/p155_160.html١٥٥

حوار مع بول ريكور، ترجمة: سامح فكري (باحث ومترجم من مصر)

* صالح، ف، (ناقد و مترجم من الاردن) من توقعات القاريء الى معنـى التجربـة الجماليـة- مجلـة نـزوى تصـدر عـن موسسـة (عمـان) للصـحافة و الانبـاء و النشـر و الاعـلان/العـدد ١٩/شـهر يوليو/١٩٩٩.

* عمراني، ا، القراء ة و التاء ويل بين امبرتو ايكو و فولفغانغ ايزر، مجلة/ فكر و النقد المغربي- العدد ٢٠٠٥،٦٧.

•

پێگەکان:

*- الحبيب، د. مصدق ، حول جدلية المعيار الجمالي في الفن و الادب: الحوار المتمدن، العدد ١٥٥٦-٢٠/٥/٢٠٠٦.

* سعدالله د.- مناهج ما بعد النصية:معرفة نحو الاخر- لە پێگەی www.odabasham.net.

*:- الشهيد، ز، تأويل النص بين الثوابت و الدلالات المفترضة- پێگەی گوگول-٢٠٠٦/٦/١١.

* شرتح، ح، الانزياح و الشعرية في النظرية النقدية و الاسلوبية الحديثة، پێگەی گوگوڵ.

* نصر، د.- الادب الشعبي و العادات و التقاليد الشعبية/ پێگەی گوگول- یان:- magazine/002/m00213a.htm

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:

١- سێبەری ئاو- کۆمەڵە شیعر-١٩٩٥.

٢- بازەمەنێك لە تەماشاکردنی ئاو بەرۆژووبین-قەسیدە-١٩٩٦.

٣- ئاگایی زمان زمانی ئاگایی-لێکۆڵینەوە-١٩٩٩.

٤- تەنیا مەرگ -سێ دەقی شانۆیی وەرگێردراو لە عەرەبییەوە-١٩٩٩.

٥- تەنیا ئاو تەنیا باران-کۆمەڵە شیعر-٢٠٠١.

٦.-پەیبردن بە ژیان، پەیبردن بەشیعر بوون-لێکۆڵینەوە-٢٠٠١.

٧-- شیعریەتی دەق-ئەدۆنیس-وەرگێرانی لە عەرەبییەوە-٢٠٠٢

٨- مرۆڤ لە روانگەی فرۆید-وەرگێرانی لەعەرەبییەوە-٢٠٠٢.

٠- خەیاڵی زمان -لێکۆڵینەوە-٢٠٠٤.

١٠- شوێنکاتی یەکەم لە دووەم و ئێستای سەرگوڕە-٢٠٠٤.

١١- ئەدۆنیس- دوو گفتوگۆی فیکری و ئەدەبییە-وەرگێرانی لە عەرەبییەوە-٢٠٠٥.

١٢- خوێندنەوەی پەراوێز، پەراوێزی خوێندنەوە-نومایشکردنی فیکری سەردەم لە چەند پەراوێزێ-لێکۆڵینەوە-٢٠٠٥.

١٣-دریدا- رەخنە لە سێنترالیزمی خۆرئاوایی-وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە-٢٠٠٥.

١٤- نووسین خۆکوژییەکی تەواو نەکراو- کۆمەڵێك وتارو گفتوگۆی ئەدەبی و فیکرییە- وەرگێرانی لە عەرەبییەوە-٢٠٠٦.